یەکەمین گۆڤاری کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی
لە کوردستاندا

35

لە پێناو گەلێکی خاوەن بڕیاردا

# بڕیار



مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی

سالی سێیەم نیسانی - ٢٠١١

## بە نەرمی، نەك بەهێز!

## دەتەوێت بەڕێوەبەرێکی سەرکەوتوو بیت؟

## فیداکاری مامۆستایەکی زانکۆ

## نوێبوونەوەو گۆڕانکاری

## سوودەکانی سێوی سەوز

## ریفۆرم لە نێوان دروشم و حەقیقەتدا!

## بابە گیان بمبەخشە، ئێستا لە خۆشەویستی تێگەیشتم

The first Magazine Specialized in Management and Human Development in Kurdistan

لە پێناو گەلێکی خاوەن بڕیاردا

# بڕیار

مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی

ساڵی سێیەم - ژمارە 35 - نیسانی 2011

خاوەنی ئیمتیاز

ئەندازیار: مەسعود تاهیر ڕۆژبەیانی

سەرنووسەر

عادل محەممەد شێخانی

sarnosar@bryarmagazine.com

بەڕێوەبەری نووسین

بەرزان ئەبوبەکر

دەستەی نووسەران

هاژە شێروانی | پەری شێخ کەریم
بێگەرد فارس | محەممەد مێرگەیی
وەهاب حەسیب | محمد هاشم محمد

ئەسکەندەر ڕەحیم

ڕاوێژکاری یاسایی

پارێزەر: ئازاد محێدین

دیزاین

قەیدار ڕەحیم

پشتیوان عەبدوڕەحمان

بەشی ڕیکلام

07480112787

چاپ: کۆمپانیای پیرەمێرد

نرخ 2500 دینار

























ناونیشانی گۆڤار

سلێمانی - شەقامی سالم -تەلاری سلێمانی مۆڵ- نهۆمی دووەم

بەرامبەر بەڕێوەبەرایەتی گشتی پەروەردە

٣١٩٣٩٤٦ - ٠٧٧٠٢١٧٨٦٨٢

هەولێر ٠٧٥٠٤٤٦٣٢٣٠

www.bryarmagazine.com

E-mail: bryar@bryarmagazine.com

دابەشکردن

کۆمپانیای پەیپەر

٠٧٧٠٨٦٤٩٢١٠



یەکەم دڵۆپ

سەرنووسەر

# ڕیفۆرم
# لە نێوان دروشمو حەقیقەتدا!

کاتێك بە دەنگێکی بەرز بەسەر منداڵەکانماندا هاوار دەکەینو بە تەواوی توڕەبوونو دەمارگیرییەوە مامەڵەیان لەگەڵ دەکەین، پێمان وایە بەو کارە زووتر دەگەینە ئامانجو خێراتر لە خودی منداڵەکانماندا ئەو ئاکارە باشانە دەڕوێنین کە دەمانەوێت، یاخود شێوازێکە خوومان پێوە گرتووەو ناتوانین دەستبەرداری بین، دەنگ بڵندکردنو سووربوونەوەو توڕەبوونو بوار بە یەکتر نەدانو هێرشکردنی بێ سنوور کە سیمای زۆرێك لە کۆڕو گفتوگۆو ڕاگۆڕینەوەکانمانە، دەکرێت بە شێوازێکی دروست دابنرێت بۆ گەیشتن بە حەقیقەتو جیاکردنەوەی بۆچوونە دروستو نادروستەکان؟!

ئایا دەکرێت گۆڕانکاری ڕادیکاڵیو نۆژەنکردنی ژیارو شارستانییەت بە دروشمی ڕەقو فیکەو هاوارو چەپڵە ئەنجام بدرێت؟

ئایا دەکرێت وەها ڕۆشنبیرییەك بکرێتە بنچینەی گەشەپێدانو پێشکەوتنو چاکخوازی؟

هەڵبەت ئێمە لە بڕیارەوە فێربووین، کە عەقڵە بچووکەکان، لە کەسەکان دەکۆڵنەوە، عەقڵە ناوەندەکانیش لە شتەکانو عەقڵە گەورەکانیش لە ڕێبازو بنەماکان..

حەز دەکەین خاوەنی عەقڵە گەورەکان بین، سەرەتا لە بنەماو پرۆسەو بەرنامەو پلانەوە دەست پێ بکەینو نەخۆشییەکان دیاری بکەینو چارەسەریان بۆ بدۆزینەوە، بە پشت بەستن بە داتاو زانیاری پێویستو نەخشەسازیو سوودوەرگرتن لە ئەزموونی ئەو وڵاتانەی کە زۆر لە ئێمە بارودۆخیان خراپتربووەو توانیویانە بگەنە لوتکەی سەرکەوتنو پێشکەوتن.

هەوڵدان بۆ چاکسازی بە وتاری بێ سەروبەرەو هەرەمەکیو تەعبیری شاعیرانەو موزایەدەی ئیقلیمیو دروشمی من چاکخوازمو تۆ گەندەڵ گەمەیەکی بێ مانایەو هیچ بەرهەمێکی نابێت.

ئەمڕۆ بەگژاچوونی گەندەڵیو هەنگاونان بۆ ڕیفۆرمو گەشەپێدان، بە دروشمی شۆڕشگێڕانەو حەماسەتو تۆڵەسەندنو ڕۆحی دوژمنایەتیو یەکتری ڕەفزکردنو یەکتری سڕینەوە نابێتو وڵات بە وتاری ئاگرینو چەكو جبەخانەو وەلامدانەوەی بەرد بە فیشەكو نەهاتنە خوارەوە لە کەلی شەیتانو دەفگرتن بە سیستەمەکانی چەرخی بەردینەوە هەرگیز لە زۆنگاوی دواکەوتنو ڕەزالەت ڕزگاری نابێت.

ئێمە نەتەوەکین سەدان ساڵە ژێر دەستەی ئەو دوژمنانەین کە درێغییان نەکردووە لە لاوازکردنی هێزوقەوارەو ڕووخاندنی کەسایەتیو خودی یەکە بە یەکەی ئەم گەلە.

ئێمە سەرەتا پێویستە لەسەر کۆمەڵێك بنەمای نەتەوەییو فەرهەنگی ڕێك بکەوین، نەك هەر کەسەو هەڵسێتو هەرچی بە خەیاڵدا بێتو هەرچی ئارەزوو کرد خاڵڕێژی بکاتو وابزانێت تەنها بە دروشمی (بڕوخێت، هەڵوەشێتەوە)، ئیتر هەموو کێشەکان چارەسەر دەبن.

ئێمە کێشەی پەروەردەییو فەرهەنگیو خەلەلی گەورەمان لە کەسایەتی تاکی کوردیدا هەیە، لە مەحکومەوە تا حاکم. ئێمە نەخشەیەکی نەتەوەییو پلانێکی قەومیو ئامانجێکی میللیمان نییە. ئێمە لەسەر ئاستی وڵاتو زمانو کەلتوورو نەتەوەو قەوارەی نەتەوەیی خاوەن ڕوونیایەکی ڕوون نین.

ئەو دروشمانەی کە بەرز دەکرێنەوە تا ئێستا لە لایەن ئەو کەسانەوە ڕوون نین کە بانگەوازی بۆ دەکەن، کەسانێك دەتوانن دیموکراسیو مافی مرۆڤو یەکسانیو دادوەری پیادە بکەن کە وەکو پەروەردەو مومارەسە ئەدایان کردبێت.

کەسانێك دەتوانن ڕێز بگێڕنەوە بۆ تاکی کورد کە ڕێزی مرۆڤیان لابێتو نەتوانن لە ڕێزی مرۆڤەکان سنور شکێنی بکەن.

ئەو کات هەرگیز ڕووی تفەنگەکەیان ناکەنە سنگی براکانی خۆیان!!

ئەو کات ئێمە دەتوانین هەنگاو بەرەو هیواو ئاواتەکانمان بنێین کە لە دەوری ئایدیایەك، کەلتورو ئەخلاقیاتێکی نەتەوەیی کۆببینەوە، ئەوسا دەتوانین وەکو ژاپۆنییەکان دەستوری وەرچەرخانو گۆڕان لە یەك هاوکێشەدا کۆبکەینەوە: زانست + ئاکارو ڕەوشتی بەرز+ کارکردن= بوژاندنەوەو پێشکەوتن.

ئێمەش بە هاوکاری هەموو دڵسۆزانی ئەم وڵاتەو بۆنەوەی چیتر بە دەوری بازنەی بەتاڵدا نەخولێینەوەو بزانین چیمان دەوێتو دەبێت چی بکەین.

لەم ژمارەیە بەدواوە وەکو ئەرکێکی نیشتمانی فۆرمی ئامادە بۆ نووسینەوەی پرۆژەی چاکسازی هەمەلایەنە لەسەر ئاستی تاكو دەوڵەت دەخەینە بەردەستی ئێوەی بەڕێزو خۆشەویست تا بتوانین بە هاوکاری هەمووومان بە شاڕێگای چاکخوازیدا بەرەو لوتکەی گەشەپێدانو پێشکەوتن وەرێکەوینو لە سەقفێکی زەمەنیدا ئێمەش وەکو ژاپۆن زامی هیرۆشیماکەمان سارێژکەین کە توانی دوای تەنها دە ساڵ وڵاتەکەی بنیات بنێتەوە!!

هەموو پێشکەوتنی وڵاتەکەش بۆ تەمەنی نەوەیەك دەگەڕێتەوە لە ماوەی (٢٣) ساڵدا ژاپۆنی گەیاندە ئەو ئاستە.

بێگومانیش کە تاکی کورد هیچی لە تاکێکی ژاپۆنی، یا ئەڵمانی، یا مالیزی، کەمتر نییە، بە هەوڵو کۆششو هاوکاری هەموو لایەك بە بەرنامەو پرۆژەی دروستەوە ڕۆژێك دەبێت وڵاتەکەمان بچێتە ڕیزی وڵاتە هەرەپێشکەوتووەکانەوە، هیچ وڵاتێکیش بە ڕێکەوت پێشە نەکەوتووە، هەر نەتەوەیەکیش خاوەنی ویستو ئیرادە بێت، پەروەردگار هەموو هێزێکی بۆ گەیشتن بە ئامانجە گەورەکانی پێ دەبەخشێت.

وەکو وتوشیانە: دەستوری ئاسمانە: خۆت بگۆڕە جیهان دەگۆڕێت!

# کارگێڕی بە گوفتار

ئەوەی باوەڕی بە هیچ نەبێت، هیچ بە دەست ناهێنێت!

هاملتۆن

گەر دەتەوێت ڕەخنەت لێنەگرن، هیچ کارێك مەکە، هیچ شتێك مەڵێو هیچ شتێك مەبە!

ئیلبرت هوبارد

بە شوێن هەڵەدا مەگەڕێ، بەڵکو بۆ چارەسەرەکەی بگەڕێ!

هنری فۆرد

کلیلی سەرکەوتن نازانم، بەلام دەزانم کلیلی شکست بریتییە لە هەوڵدان بۆ ڕازیکردنی دڵی هەموو خەڵکی!

بیل کوزبن

ئێمە هەرگیز لە ساتەکانی شکستدا بیرناکەینەوە!

ڤیکتۆریا

پێشکەوتن و پەرەپێدانی سەرکردە، پێشکەوتنی شوێنکەوتووان دیاری دەکات!

## کارگێڕی بە چیرۆك

# بە نەرمی نەك بەهێز!



خۆرو ڕەشەبا بوو بە کێشمەکێشیان، هەر یەکەیان لافی ئەوەی لێدەدا کە بەهێزترە لەوەی دی، بۆ سەلماندنی ئەوکارەش بڕیاری پێشبڕکێیان دا، بۆ ئەوەی کابرایەکی ڕێبوار ناچار بکەن کە جلوبەرگەکانی دابکەنێت، هەر کامێك لەوان لەم کارەدا سەرکەوتوو بوو ئەوا ئەوی تر ملکەچ دەبێتو دان بە ئازایەتیو بەهێزی ئەودا دەنێت.

سەرەتا ڕەشەبا بە توندی هەڵیکرد، بۆ ئەوەی جلوبەرگی کابرا ڕامالێت، بەلام کابرا خۆی توندوتۆڵ کردوو زێتر جلوبەرگەکانی لە خۆیەوە ئالاند، ڕەشەبا هەوڵەکانی چڕتر کردو توندتر هێرشی هێنا، کابراش قۆپچەکانی هەموو داخستنو قایشەکەی توندکردو زێتر گورجوگۆڵیو توندوتۆڵی نواند.

دوای هەوڵدانێکی زۆر، ڕەشەبا ئالای سپی هەڵکردو دەستەوەستانی خۆی ڕاگەیاند.

نۆرە هاتە سەر خۆر:

سەرەتا تیشکی خۆی بلاوکردەوەو گەرمی خۆی وەکو هەموو ڕۆژێك پەخشکرد.

کابراش سەرەتا چاکەتەکەی داکەند، لەگەڵ بە تین بوونی خۆرەتاوەکەدا، هێدی هێدی جلەکانی سەرەوەی داکەند، کاتێك گەرمای خۆرەتاوەکە بە توندی هێرشی بۆ هێنا، ناچار ڕووی کردە دەریاو تەنها جلوبەرگی ناوەوەی هێشتەوەو خۆی فڕێدایە نێو دەریاکەو بۆ خۆ فێنك کردنەوە دەستی بە مەلەوانی کرد.

**لەم چیرۆکەوە فێر دەبین:**

١- توندوتیژی هیچ کاتێك کێشەکان چارەسەر ناکات، بەڵکو بە پێچەوانەوە هەندێجار کێشەکان گەورەتر دەکات.

٢- هێزو دەسەلات هەمیشە سەرچاوەی هێزو توانا نییەو هەموو کارێك بە بەکارهێنانی هێز بە ئەنجام ناگات.

٣- بەکارهێنانی هێزو توندوتیژی نابێتە مایەی سەرکوتکردنو بنبڕکردنی بەرەنگاربوونەوەی بەرامبەر، بەڵکو وادەکات بەرامبەر زێتر لە سەر بۆچوونی خۆی سور بێتو ڕۆحی بەرەنگاربوونەوەی بەهێزتر بێت.

٤- باشترین هۆکار بۆ گۆڕینی بۆچوونی بەرامبەر قەناعەت پێکردنە، هەرکاتێك توانیمان قەناعەت بە بەرامبەرەکەمان بکەین، ئەوا بە ئاسانی دەتوانین گۆڕان لە خودو بیروبۆچوونەکانیدا ئەنجام بدەین.

٥- ئەوەی دەتوانین بە هێمنیو نەرمو نیانی بە دەستی بهێنین، هەرگیز ناتوانین بە توندوتیژی بە دەستی بهێنین، کوردیش دەڵێت: بە قسەی خۆش مار لە کون دێتەدەر.

٦- بە لە یەکگەیشتنو لێك حاڵی بوونو گوێگرتنو ئامۆژگاری دڵسۆزانە، دەتوانین هەموو کێشەکانمان چارەسەر بکەینو پەنا بۆ ڕقو کینەو توندوتیژی نەبەین.

٧- لەوانەیە بتوانی بە هێزو دەسەلات توانای بەرامبەر بۆ ماوەیەك کپ بکەیت، بەلام دەبێت هەمیشە لە چاوەڕوانی تەقینەوەی بورکانێکدا بیت.



ئا: هەڵگورد مەسعود شاکر



# سەرکردایەتی

## بەڕێوەبەر:

بە لەبەر چاوگرتنی ڕۆڵو گرنگی بەڕێوەبەر بە باشمان زانی ئەم بەشە تایبەت بکەین بە (بەڕێوەبەر)، تاوەکو ڕوونترو زانستیانە تر لە چەمکی بەڕێوەبەر تێبگەین، ئەم بەشەش حەوت خاڵ لە خۆدەگرێت:

### یەکەم: پێناسەی بەڕێوەبەر:

بەڕێوەبەر "بریتییە لە پێویستییەکی بنەڕەتی بۆئەوەی میکانیزمی دەزگاکە پەکی نەکەوێتو سەرپەرشتیارێك هەبێت لەو بوارەی کە دەزگایەکەی لە پێناویدا هاتووەتە کایەوە". ئەمە یەکێکە لەو پێناسانەی کە بۆ بەڕێوەبەر کراوە، بەڵام شارەزایانی کارگێڕی لە پێناسەیەکی دیکەدا بەمجۆرە پێناسەی کەسی بەڕێوەبەر دەکەن "بەڕێوەبەر پیاوێکە بڕوای بە دەستوورو یاساکانی دەزگاکەی، یاخود کۆمپانیاکەی هەیە، کارەکانی لە دانانی نەخشەوە دەست پێدەکات، لە جێبەجێکردندا کۆتایی دێت، بە فەرماندانو بەدواداچوونو چاودێریکردنی ڕاپەڕاندنی کارەکانیشیدا تێدەپەڕێت، هیچ لارییەکی نییە لەوەی هەموو تەمەنی وەزیفی خۆی لە بەدواداچوونی وردەکارییەکانو پشتبەستن بە بڕیارەکاندا بەسەر بەرێت".

بەڵام تا ئێستاش وشەی (بەڕێوەبەر) وەك هاومانای دەسەڵاتو دەستبەسەراگرتن سەیر دەکرێت، ئەمەش مانایەکی سەیرو نادروستە بۆ ئەم وشەیە، لەوەش سەیرتر ئەوەیە لەگەڵ وشەی (بەرپرسو لێپرسراو) هەمان ئەو مانایەی دەسەڵاتو بەسەرداگرتن بەکاربهێنرێت، لەگەڵ ئەوەی بەرپرس، واتە: ئەو کەسەی لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەکرێت لەوەی کە ئەنجامی دەدات، بەڵام مانای ڕاستو دروست بۆ وشەی (بەڕێوەبەر) بریتییە لە چاودێریکردنو ئاگاداربوون لە بارودۆخی فەرمانگەکەی، یاخود ڕێکخراوەکەی.

بۆیە دەبێت ئێمە بە باشی جیاوازی بکەین لە نێوان بەڕێوەبەرو بەرپرسدا، چونکە بەرپرس بەرپرسیارە لە یەکەیەك، یان قەوارەیەکی بچووكو دیاریکراو لە ڕێکخراودا، ڕەنگە زیاتر بە شێوەیەکی کاتیش بێت، بەڵام هەرچی کەسی بەڕێوەبەرە بەرپرسیاریەتی ئەو فراوانترو گشتگیرتری هەیە، بەتایبەتی لە ڕووی سنووری دەسەڵاتی ڕێکخراو، ئەمە بەدەر لەوەی بەڕێوەبەر بە نوسراوێکی فەرمیو ئاگادارکەرەوە دەبێت بە بەڕێوەبەر لەو شوێنەی کە لەدەزگاکەی بۆی دیاریکراوە.

### دووەم: ئەرکەکانی بەڕێوەبەر:

- پلاندانان: بریتییە لە مەزندەکردن لە کارکردن، کە چۆنو کەیو لە کوێ دەکرێت، هەروەها کارکردن لەسەر هەندێ پلانو بنەمای دروست بۆ ئەوەی بۆچوونەکانی بەڕێوەبەر ڕاست دەربچێتو ئەنجامی باشی لێبکەوێتەوە، لە چالاکی بوارە جیاوازەکانی ڕێکخراودا.

- ڕێکخستن: ئەمەیان بریتییە لە ڕێکخستنی گشت ئەركو چالاکییەکانی تایبەت بە ڕێکخراو، چونکە لە ڕێگای ئەم ئەرکەوە دەتوانین هەموو لایەنو چالاکییە پەیوەندیدارەکان ڕێکبخەین، هەروەها ئەم خاڵە زۆر گرنگە بۆ ناو ڕێکخراویش، بۆ ڕێکخستنی پەیوەندی نێوان بەڕێوەبەرو کارمەندەکان، ڕێکخستنیش دوو جۆری هەیە، ڕێکخستنی فەرمیو نافەرمی.

- هاندان: ئەم ئەرکەش بریتییە لە هاندانی گشت لایەنەکانی ڕێکخراو بە تایبەت فەرمانبەرەکان لەلایەن بەڕێوەبەرەوە، چونکە سروشتی مرۆڤ ئەوە دەخوازێت، کە بەردەوام پێویستی بە هاندانو ستایشکردنە جا چ لە ڕووی مادی بێت، یاخود مەعنەوی، ئەگەرچی هەندێك لە تیۆرەکان پێیانوایە کرێکارانو فەرمانبەران دەبێت تەنها لە ڕووی مادییەوە هان بدرێن، بەڵام چەند تیۆرێکی تر بە پێچەوانەی ئەم بۆچوونە دەڵێن ناکرێت تەنها گرنگی بەلایەنی مادی بدرێت، چونکە هاندانی مەعنەویش فاکتەرێکی گرنگە بۆ ئەوەی فەرمانبەرانی ڕێکخراوەکە بە شێوازێکی باشترو دڵسۆزانەتر هەوڵەکانیان چڕبکەنەوە، بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەمانی ڕێکخراو.

- چاودێری: ئەمەش گرنگترە لە ئەرکەکانی تر، چونکە ڕۆڵی مەزنی هەیە لەبەرەو پێشبردنو ڕاستکردنەوەی هەڵسوکەوتەکانو سیستەمو ڕێنمایی، لەگەڵ یاساکان. چاودێری ئەو ئەرکە کارگێڕیەیە کە دووپاتی ئەوە دەکاتەوە چالاکییەکان ئەنجامی خراپی لێ نەکەوێتەوە.

### سێیەم: خەسڵەتەکانی بەڕێوەبەری نموونەیی:

١- دەستپاکی: مەرجی سەرەکی هەموو کارێکە، بەڵام بۆ بەڕێوەبەران زۆر پێویستە، لەبەرئەوەی بەڕێوەبەر هەموو مافەکانی دامەزراوەکەو فەرمانبەرەکانی لە ئەستۆدایە، بۆیە ئەگەر دەستپاك نەبێت مافەکان ون دەبنو فەرمانگەکەو کارەکانیش شکست دەهێنن، کەواتە ئەگەر دڵسۆزی مەرجێك بێت بۆ سەرکەوتن، ئەوا دڵسۆزی بەبێ دەستپاکی هەرگیز وەدەست نایەت.

٢- زانستو زانیاری: کارکردن بە زانستو زانیاری تایبەتمەند فاکتەری سەرکەوتنەکانن، بەڕێوەبەر بەبێ زانست دەبێتە بەرپرسێکی ئاسابیو ڕۆژانە بە پێی شارەزابوون کارەکان بەڕێوەدەبات، بەبێ شارەزایش دەبێتە بەرپرسێکی تیۆریو لە کاتی پێویستدا ناتوانێت هیچ هەڵوێستێك لە کارکردن بنوێنێت.

٣- ڕاستگۆیی: لەبەرئەوەی کەسی درۆزن هیچ کەسێك باوەڕی پێ ناکات، بۆیە ڕێزو هاوکاری دەوروبەرەکەی لە دەست دەدات، کەواتە ئەگەر هاتوو بەڕێوەبەر ئەم سیفەتەی تێدا نەبوو، ئەمە دەبێتە خاڵێکی نێگەتیڤو هەمیشە شکست بە هەوڵەکانی دێنێت لە کارەکانیدا.

٤- ڕاوێژکردن: تاکڕەوی لە کارکردندا تەنیا جەستەی خەڵك بەکاردێنێت بەبێ دڵسۆزیو تواناو دڵی ئەوان، بەردەوامیش بە ئاراستەی کاریاندا دەبات، بەڵام بە هەڵەو کەمو کورییەکی زۆرەوە.

٥- دانان بە هەڵەکاندا: ئەگەر دەرکەوت بەڕێوەبەر لە کردارێکدا هەڵەی کردووە، دەبێت داوای لێبوردن بکاتو دان بە هەڵەکەیدا بنێتو بەردەوام نەبێت لەسەر هەڵەکەی.

٦- سروشتی کەسایەتی: "هەر هەموومان وەك شاخێکی بەفرینین، ئەوەی لە دەوروبەرمانە زۆر بچوکترە لەوەی

ونو نادیاره، هەر یەك لە مرۆڤەكان دوو كەسایەتی هەیە: كەسایەتی ڕواڵەتیو ناوەوە، خەڵك بە كەسایەتی ڕواڵەتی دەمانبینن، دەشتوانن لە ڕێگای هەڵسوكەوتەكانمان كەسایەتی ناوەوەشمان بخوێننەوەو بماننناسن" كەواتە دەبێت بەڕێوەبەر بە سروشتی خۆی هەڵسوكەوت بكات لە ناو فەرمانبەرەكانی، چونكە ئەو مرۆڤەی ڕووی ناوەوەی شتێكەو ڕووی دەرەوەی شتێكی ترە، بەردەوام كەسێكی میزاجیو تووڕەو توندە ئەمەش بە هۆی ئەو بارە دەروونییە خراپەی كە تێیدا دەژی، بە هۆی جیاوازی كەسایەتی ڕووی ناوەوەو دەرەوەی، واتە لە ڕواڵەتی دەرەوەی كەسایەتیەكە لە ناوەوەش كەسایەتیەكی ترە.

٧- لێهاتوویی: لێهاتوویی لە بەڕێوەبەرایەتیدا بریتییە لە كۆمەڵێك لێهاتوویی بیروهۆشی، كە بەڕێوەبەر پرۆژەیەكی تایبەت، یان گشتی ئەنجام دەدات بۆ گەیشتن بە مەبەستەكان هەوڵ دەدات ڕێگایەك بدۆزێتەوە كە بتوانرێت ئەنجام بدرێت.

چوارەم: بەرپرسیاریەتییەكانی بەڕێوەبەری چالاك(كارا):

ئەو بەڕێوەبەرەی دەیەوێت سەركەوتوو بێت لە پۆستەكەیدا، دەبێت لە هەموو كارمەندەكانی دڵسۆزترو ماندووتر بێت، واتە: هەوڵدانو چالاكی جدی ئەو دەكات بە بەڕێوەبەرێكی سەركەوتوو، ئەمەش بە ڕاپەراندنی ئەو ئەركانەی كە لەسەر شانیەتی، وەك بەڕێوەبەر.

- بەرپرسی ڕاستەوخۆیە لە بەرامبەر یەكەو سەرۆك بەشەكان لە ڕووی ئارامیو ئاسایشەوە.

- دەبێت دڵنیابێت لە ئامادەبوونی تەواوی كارمەندەكان، بۆیە دەبێت لە ناكاو شوێنی كارەكانیان بەسەر بكاتەوە، هاوكات دەبێت كارمەندەكانیشی ئاگاداری نوێترین ڕێنماییو زانیارییەكانی بەڕێوەبەر بن.

- وەرگرتنی سكاڵا سەبارەت بە كێشەكان، هەروەها پێویستە ڕووداوەكان لە پەڕاوی ڕۆژانەدا تۆمار بكات، بەڵام سەبارەت بە كێشە گرنگەكان دەبێت چارەسەری كاتی بۆ بدۆزێتەوە، تاوەكو شوێنەوارەكانی نەمێنێت، بەپەلەش لایەنی پەیوەندیدار لەو ڕووداوە ئاگادار بكاتەوە.

- بەرپرسە لە شەفتی دەوامكردنی سەرپەرشتیارانو كارمەندەكان، دەبێت دڵنیابێت لەوەی كە ئایا كاتژمێرەكانی كاركردنیان، وەكو خۆی بەكارهێناوە بۆ كارەكان؟

- بەرپرسە لە دەرچوونی هەموو كارمەندە نێردراوەكان بۆ سەر شوێنی كار، (١٠) خولەك پێش دەستپێكردنی كارەكەو گەیشتن بە شوێنی دیاریكراو لە كاتی دیاریكراوی خۆی.

- دڵنیابوون لە هەموو پێداویستییەكانی ڕێكخراو، یان فەرمانگەكەی، وەكو لە كاركەوتنیان ئۆتۆمبێلو چاكردنەوەیانو ئامێرەكانی تری كاركردنو گواستنەوە، تاوەكو كارەكان بە خێرایی بەڕێوە بچن.

- بەڕێوەبەری چالاك هەر ئەوەندە پێویستی بە دەسەڵاتەكە هەیە، تا ئەو كاتەی كارمەندەكانی پابەندبن بە بڕیارەكانی، ئەگەرنا ئەو تەنها وەك ڕاوێژكارێكە لە دەزگایەكەیدا لە نێوان خۆیو كارمەندەكانی لە كاتی گفتوگۆكاندا، ئەم ئەركەش برایەتیو هاوڕێیەتی بە هێز دەكات لە ناو دەزگاكەدا.

- لەبەرئەوەی بەڕێوەبەر بەرپرسی یەكەمە لە هەموو مەترسیو بارودۆخەكانی ڕێكخراو، بۆیە دەبێت لە هەندێ كاتدا هەم توندوتیژ بێت، هەم نەرمونیان.

- بەڕێوەبەری چالاك ڕێساو یاساكان تێكهەڵكێش دەكات، بۆ ڕێكخستنی كارەكانو بە دەستهێنانی ئامانجەكان.

- بەڕێوەبەری چالاك شتێك ناكات كردنی زۆر ئاسان بێت، بەڵكو كارێك دەكات كردنی ئەستەم بێت.

- ئامادەكارو گریمانەی تەواو دادەنێت بۆ كێشەو كارەساتەكان پێش ڕوودانیان.

پێنجەم: قۆناغەكانی هەڵبژاردنی بەڕێوەبەر:

هەڵبژاردنی بەڕێوەبەر، یان دیاریكردنی بە چەند قۆناغێكدا تێدەپەڕێت، (قۆناغی دیاریكردن، قۆناغی هەڵسەنگاندن، قۆناغی چاوپێكەوتن، قۆناغی هەڵبژاردن)، مەبەست لە دانانی ئەم قۆناغانەش بۆ ئەوەیە، كە ئەو كەسەی دیاریكراو بۆ پۆستی بەڕێوەبەر دەبێت كەسێكی شیاوو لێهاتوو بێت، بێگومان كەسی پاڵێوراو، یاخود دەستنیشانكراو، ئەگەر بە چەند قۆناغێكی تاقیكردنەوەی لەم شێوەیەدا تێنەپەڕێت، ئەوا ئەو بەڕێوەبەرەمان دەست ناكەوێت، كە پێویستمانە بۆ گرتنە ئەستۆی بەرپرسیاری ڕێكخراوەكەمان.

* قۆناغی دیاریكردن: یەكەمین قۆناغە بۆ پێدانی پۆستی بەڕێوەبەری، دەبێت پاڵێوراو بەو ویستگەیەدا تێپەڕ بێت وەك ئاسانكارییەك بۆ قۆناغەكانی تر، ئەمەش سەرەتا دەبێت ژیاننامەیەكی كورت (CV)ی لەو كەسە وەربگرین" كە پەیوەندی هەیە بە ژیانی تایبەتی كەسی پاڵێوراوو دیاریكردنی لێهاتووییو ئەو كارانەی كە پێشتر ئەنجامی داوەو تێیدا سەركەوتوو بووە، گرنگترین ئەو پۆستانەی هەیبووە لەگەڵ چالاكییەكانی لە شوێنی پێشوو، ئینجا لەم ڕوانگەیەوە تێبینیەكان وەردەگرین لەسەر كەسایەتی ئەو كەسە كە پێویستن بۆ پۆستە بەتاڵەكە، دواتر بڕیاری ئەوە دەدەین كە ئایا ئەو كەسە دەگونجێت بۆ ئەو پۆستە، یاخود نە".

لەبەرئەوەی ئەم قۆناغە هەنگاوی سەرەتاییە بۆ دیاریكردنی بەڕێوەبەرێكی شیاو، بۆیە ئەو كەسانەی داوایان پێشكەش كردووە سەرەتا پشكنین بۆ ئەو داوایانە دەكەینو دواتر یەكە یەكە دیاری دەكرێنو ڕەوانە دەكرێن بۆ قۆناغەكانی تر.

* قۆناغی هەڵسەنگاندن: لەم قۆناغەدا ئاستی خوێندەواریو بە تواناییو خولی ڕاهێنانەكان گرنگە بۆ كەسی پاڵێوراو، بەڵام دەبێت ئەو كەسە ئەوەش بزانێت خوێندەواریو دەرچوونی لە خولی ڕاهێنانەكان بەس نییە بۆئەوەی ببێتە بەڕێوەبەرێكی سەركەوتوو، بەڵكو "گرنگ ئەوەیە كەسی پاڵێوراو توانای ئەوەی هەبێت بە ئاسانی لە خەڵكو كارمەندەكانی تێبگاتو كاریگەری هەبێت لەسەریان، كارەكان بەرەو یەك ئاراستە ببات لەسەر بیروڕاجیاوازەكان، ئەمە جیا لەوەی دەبێت بابەتی بێت لە بیركردنەوەدا".

هەڵسەنگاندنیش بە "وردبوونەوە لە كارەكانی پێشوویو ڕاپۆرتە نهێنییەكان لە بۆچوونو كەسایەتی كەسەكە لە ڕێگەی پرسیاركردن لە بەرپرسەكانی پێشوویو هاوڕێكانی".

* قۆناغی چاوپێكەوتن: چاوپێكەوتن بەشێكی گرنگە بۆ دیاریكردنی كەسی شیاو بۆ پۆستی بەڕێوەبەر "بۆیە لە كاتی چاوپێكەوتنەكاندا چەند بەڕێوەبەرو شارەزایەك ئامادە دەبن بۆ ئەوەی لێهاتوویی كەسی پاڵێوراو دیاری بكەن، ئەمەش لە ڕێگای ئەو پرسیارانەی كە لێی دەكرێت، وەكو ئایا ئەو پاڵێوراوە بۆ چ ئامانجێك هاتووەو چی لەلا گرنگە لە كاری ڕێكخراوەییو خێرایی تێگەیشتنی چەند بۆ بارودۆخو هەڵوێستەكان" بەڵام نابێت ئەو كەسانەی چاوپێكەوتن ئەنجام دەدەن بە كاری ترەوە خەریك بن بۆ نموونە: وەڵامدانەوەی تەلەفۆن لە ناو چاوپێكەوتنەكان، یان هەبوونی مەوعید لەگەڵ لایەنی تر، چونكە كەمتەرخەمی لە قۆناغی چاوپێكەوتن دەبێتە هۆی لە دەستدانی گرنگی چاوپێكەوتنو نەكردنی گفتوگۆی تەواو لەگەڵ كەسی پاڵێوراودا، بەم جۆرەش ناتوانین كەسێكی شیاومان دەستكەوێت بۆ ئەم پۆستە.

* قۆناغی هەڵبژاردن: ئەم قۆناغە كۆتایی بە پرۆسەی دیاریكردنی بەڕێوەبەر دەهێنێت، واتە بەو مانایەی تەواوكەری قۆناغەكانی پێشووترە، چونكە لێرەدا تەنها ئەوەی دەمێنێتەوە ئەوەیە: ئایا سەرپەرشتیارانی پرۆسەی هەڵبژاردنو دیاریكردنی بەڕێوەبەر چەند توانیویانە بە باشی زانیارییەكان كۆبكەنەوە لەسەر كەسە پاڵێوراوەكانو گەیشتنیان بە بڕیاری دروستو كارگێڕی بۆ دەستنیشانكردنی بەڕێوەبەرێكی لێهاتووو شیاو بۆ پۆستی بەڕێوەبەری ڕێكخراوەكەیان.

# پرۆسەی هەڵسەنگاندنی فەرمانبەر



و: عومەر عەبدولقادر

(پەندێکی هیندییە سوورەکان هەیە، دەڵێت: بەر لەوەی مرۆڤێك کارێك بگرێتە دەست، با بۆ پێنج خولەکیش بێت.. بە هیچ چەشنێك بڕیاری بەسەردا مەدە).

لە دامەزراوەکاندا، ئامانج لە نووسینی خەڵکیدا، هەڵسەنگاندنی ئەرکی فەرمانبەری و بەجێهێنانی ئەرکەکانیانە، بە شێوەیەکی بابەتیانە.

ئەگەر بڕیارێك لەسەر هەر فەرمانبەرێك دەربچێت، ئەم بڕیارە شوێنەوارو دەرەنجامی ئەرێنیی و نەرێنیی و گرنگ لە پاش خۆی بەجێدەهێڵێت، لەبەرئەوە پێویستە ئەو بڕیارە بە دواداچوون و لێکۆڵینەوەی وردی بۆ کرا بێت و هاوسەنگ و دادپەروەرانە و بابەتیانە بێت.

پێویستە لەسەر کەسی هەڵسەنگێنەر، پێش ئەنجامدانی هەڵسەنگاندنەکە، زانیاری پێویست و وێنەیەکی تەواوی سەبارەت بە فەرمانبەرەکە هەبێت، بەڵکو بە تەنها هەندێك ڕواڵەت و دیمەنی کاتیی و هەڵسوکەوتی ئێستەیی، بۆ هەڵسەنگاندن بەس نین.

لە پرۆسەی هەڵسەنگاندندا زانین و ئاشنابوون بە سیفەتە زۆر دیارو باوەکانی فەرمانبەرەکە، کارێکی پێویستە، هەرچەندە ئەم سیفەتانەش ڕێژەیین.

دەبێت لە بارەی تواناکانی، بەهرەو

لێهاتووییە تایبەتییەکانی، لە بارەی هەر پاڵنەرێك کە بەرەو بەگەڕخستنی ئەو بەهرەو توانایانە، ئاراستەی دەکەن، پرسیاری لێ بکرێت.

پێویستە هەڵسەنگاندن، لەسەر بنەمای تێبینیکردن و چاودێریکردنێکی درێژخایەن بنیاد بنرێت. هەروەها پێویستە هەڵسەنگاندنی ڕەفتارو سیفەتەکانی فەرمانبەرەکە، بە گوێرەی ئەو ڕەفتارو هەڵسوکەوتانەی بێت کە لە بواری کارەکەی و لە ناوەندە کۆمەڵایەتییەکەیدا پێی دەرکەوتووەو ناسراوە.

تەنانەت هەڵسەنگاندنی مرۆڤ بەشێوەیەکی ڕاستو دروست، بەبێ ڕەچاوکردنو هەڵسەنگاندنی ئەو ژینگەو دەوروبەرەی تیایدا دەژی، ناکرێت.

وەك نموونەیەك بۆ ئەم بابەتە باسی پێگەی خێزان دەکەین، خێزانو پەیوەندییە خێزانییەکان، ڕۆڵو کاریگەری گەورەیان لەسەر ئاکارو ڕەفتاری فەرمانبەر هەیە، ئەگەر فەرمانبەر لە لایەن خێزانەکەیەوە دەستخۆشانەو ڕێزێکی باشی لە بەرامبەر ئەنجامدانی پیشەکەیدا پێبەخشرا، ئەمە هەستی متمانەبەخۆبوونی لە لا زیاد دەکات، بە پێچەوانەشەوە هەر ڕاستەو کاریگەری نەرێنی دەبێت. لەبەرئەوە پێویستە لەسەر سەرکردەو بەڕێوەبەر بایەخێکی زۆرتر بە بەرپرسیارێتی ژینگەی خێزانیی فەرمانبەر بدەن، تا بتوانن لە هەندێك دۆخو کاتی تایبەتو دیاریکراودا باشتر لە هەڵسوکەوتو ڕەفتاری فەرمانبەرەکە تێبگەن.

هەر لەبەر ئەمەشە کە لەم سەردەمەدا، زۆرێك لە دامەزراوەکان، لە لێکۆڵینەوەو بەدواداچوونی هەندێك چالاکی دیاریکراوو پەیوەست بە کاری دامەزراوەییەوە، بارودۆخو ڕەوشی ژیانی فەرمانبەرەکانیان لەبەرچاو دەگرن، تا بتوانن هەڵوێستی خێزانەکانیان، بەشێوەیەکی ئەرێنییانە بەرامبەر دامەزراوەکە بە دەستبهێنن.

ئاسایە کەسانێك هەبن بتوانن هەموو لێهاتوویيو توانایان بە کارەکەیان ببەخشن، بێئەوەی لە بۆنەو بارودۆخە تایبەتییەکاندا، هیچ دەستخۆشیو سوپاسێکیان ئاراستە بکرێت.

لەبەرئەوەی دەوروبەرو ژینگەی کۆمەڵایەتی، لە پێکهێنانی ئاکارو ڕەفتاری مرۆڤدا ڕۆڵی گەورە دەبینن، پێویستە لەسەر سەرکردە بە هەمان شێوە هەڵسەنگاندن، بۆ ئەم بابەتو لایەنەش بکات.

لە ڕۆژگاری ئێستەشماندا ناگونجێت ئەم لایەنە لە دۆخی کارگەو فەرمانگەکان جیابکرێتەوە، هەروەك ناکرێت لایەنی ئابووریش لە کۆمەڵگە جیابکرێتەوە، چونکە لە هەموو سەردەمەکانی ڕابردوودا، تێکەڵبوونی ئەم دوو بوارە لە یەکدی، زۆر بەهێزتربووە، تەنانەت دەشگوترێت: «ڕەوشتو ئابووری، دوو ڕووی دراوێکن».

سەرەڕای ئەمەش ژمارەی ئەو فەرمانبەرانەی کە بەبێ مشتومڕ، ڕێنماییو فەرمانەکانی سەرکارو بەرپرسەکانیان جێبەجێ دەکەن، وردە وردە ڕوو لە کەم بوونن.

لەبەرئەوە پێویستە سەرکردەکان بەشێوەیەکی ورد، لێکۆڵینەوەو شیکردنەوە بۆ بڕیارو ڕاسپاردەو فەرمانەکانیان بکەن، هەروەها ناکرێت گۆڕانی ئەم ئاکارو ڕەفتارە، ببێتە مایەی دەرکردنی بڕیاری هەڵە، سەبارەت بە فەرمانبەران، چونکە توانای ڕەخنەگرتنی بنیاتنەرو ئەرێنی فەرمانبەر بەندە بەوەی کە تا چەند کەسێکی ئەرێنییە، تەنانەت ئەگەر ئەم ڕەخنە بنیاتنەرە ببێتە هۆی دروستبوونی هەندێك گرفت بۆ بەشێك لە لایەنی سەرکردایەتی.

لە کۆڕبەندێکدا کە لە بڕۆکسل لە ژێر دروشمی «بەڕێوەبەرانی ساڵی ۲۰۰۰»دا ساز کرا.. ئەم دیاردە نوێیە کە خۆی لە توانای ڕەخنەگرتندا دەبینێتەوە، بەم شێوازە وەسفکرا: «لە پێشوودا بارودۆخی ناو دامەزراوەکان بە چەشنی بارودۆخی ناو سوپا بوو، کاتێك دەگوترا: پەلاماری ئەو گردە بدەن! فەرمانەکە بێ چەندوچوونو بە وردی جێبەجێ دەکرا، بەڵام ئەمڕۆ فەرمانبەری ساڵی ۲۰۰۰، دەڵێت: بۆچی ئەو گردە؟» لەم کاتەشدا پێویستە لایەنی سەرکردایەتیو بەڕێوەبردن، وەڵامو بیانووی ڕازیکەر بۆ ڕێنماییو ڕاسپاردەکانی بهێنێتەوە.

لە سەردەمی ئێستاماندا سەرکردایەتیکردن، تا ڕادەیەکی زۆر قورسو دژوار بووە، ڕەنگە لە داهاتوودا دژواتریش بێت، وەها نابینرێت ئەم دۆخە ببێتە هۆی دروستبوونی گرفت بۆ سەرکردە، لەبەرئەوەی فەرمانبەر لەم بارودۆخەدا، زۆرتر تاکڕەوو سەربەخۆ دەردەکەوێت. دواتر ئەمەش بەبێ هیچ چەندوچوونێك وای لێدەکات لە جێبەجێکردنی ئەو بڕیارو ڕاسپاردانەی پێی دەسپێردرێت بەردەوام نەبێت، بەڵکو خۆی بەرپرسانەتر کارەکانی ڕاپەڕێنێت.. ئەمەش بۆ سەرکردە ڕێخۆشکەر دەبێت.. چونکە فێر دەبێت چۆن ڕەخنە پەسەند بکاتو بەشێوەیەکی ڕاست هەڵیبسەنگێنێتو بۆ باشترکردنی سەرکردایەتیکردنەکەی، کەڵکی لێ وەربگرێت. هەستیاربوونو بە توانابوون لە گفتوگۆدا، دوو مەرجی بنەڕەتین بۆ کەسێك کە دەخوازێت بە شێوەیەکی گونجاوو ڕێکوپێك.. توانای هەڵسەنگاندنو خەملاندنو بڕیاردانی هەبێت.

کەواتە هەڵسەنگاندنی بابەتییانە، بۆ هەر فەرمانبەرێك بە شێوازێکی ڕاستو دروست بەدی نایەت.. تا ئەو کەسەی هەڵسەنگاندنەکە ئەنجام دەدات:

١- بە باشی فەرمانبەرەکە بناسێتو پێی ئاشنا ببێت، ئەمەش ئەوە دەخوازێت کە ئەو کەسە بە شێوەیەکی وردو گشتگیر گەڕانو بەدواداچوون بۆ کەسێتی فەرمانبەرەکە بکاتو خواستو بەهرەو تواناکانی بزانێت.

٢- شارەزاو ئاشنا بێت، بەو ژینگە کۆمەڵایەتییەی تێیدا دەژی.

٣- ڕێ بە خۆی نەدات، بڕیاری تاکلایەنەو خێرا بدات، بەڵکو شێوازی هەڵسوکەوتو ڕەفتارە باوەکانی فەرمانبەرەکە بۆ ماوەیەکی درێژ لەبەرچاو بگرێت.

سەرچاوە/ الإدارة بالتوافق: نوربرت هرمان. ترجمە: د. هانی صالح. ص: ١٣٦ -١٣٩

# هەنگاونان بۆ نواندنی ڕۆڵی بەڕێوەبەر لە یەکەم جاردا



لە ئینگلیزیەوە: کاروان چۆمانی

**لە شوێنی کارکردنت تازە بۆ یەکەم جار پلەکەت بەرزکراوەتەوە بۆ بەڕێوەبەر.** پیرۆزە! ئێستا ئەو هەنگاوانە چین پێویستە بیگریتە بەر وەکو بەڕێوەبەر؟ باوەڕدەکەی، یان نا؟ کە ئێستا هەموو شتێك گۆڕاوە، پێویست دەکات بەشێوەی گونجاو مامەڵە بکەیت.

گۆڕینی پلەکەت بۆ بەڕێوەبەر هیچ زەحمەتێکی تێدانییە، تاوەکو ماندووت بکات. بەڵام بەئاگایی‌و وردبینی تەواو هەڵدەگرێت سەرەڕای توانای خۆڕێکخستن. چونکە ئەمە هەمان پیشە نییە وەك هەمیشە لە ڕابردوو، بەڵکو سەرەڕای ئەوەی لەوانەیە بۆ ماوەیەکی درێژ ئامادەگی‌و ئەزمونت هەبێت لە ئۆفیسەکە، یان پەیوەندییەکی باشت هەبوو بێت لەگەڵ کارەکە، بەڵام ئەمجارە داخوازییەکان لە تۆ جیاوازن. گرنگە وردبینی لە سەرنج‌و تێبینییەکانت گۆڕانکاری بەسەردا هاتبێت، شێوازی پەیوەندی‌و ڕەفتارت لەگەڵ هاوکارەکانی پێشوت پێویستە گۆڕابێت.

وەك بەڕێوەبەرێکی نوێ، پێویستە پەیوەندی نوێ لەگەڵ هاوکارەکانی پێشوت دروست بکەیت. سەرەڕای ئەوەش کە دەتوانی پەیوەندییە دۆستایەتییەکانت بەردەوام بن لەگەڵیاندا. پێویستە سنوری نوێ دابنێی لە نێوان خۆت‌و ئەواندا، لە پێناو جێبەجێکردنی بڕیارەکانت‌و بنیاتنانی متمانەی بەڕێوەبەرایەتی. بەڵام نەك بە مانای خۆسەپاندن‌و ناچارکردنی زۆرە ملێ بۆ فەرمانەکانت. بەڵکو ئەوە گرنگیدانی زیاترە بە ئەرکەکەت بۆ سەلماندنی لێهاتوویت وەك ڕابەری کارەکە.

کارێکی قورسە بۆ هاوڕێ‌و هاوپیشەکانت پاش چەند ساڵ پێکەوەبوون لە شوێنێك، ئێستا وەك بەڕێوبەرەکەیان مامەڵەت لەگەڵدا بکەن. لە مەودوا کاری تۆ هەڵسەنگاندنی شێوازی جێبەجێکردنی کارەکانیان‌و پێدانی ڕێنماییە. ئەمەش کەشێکی سەیرو نامۆ لە نێوان تۆ لەگەڵ هاوڕێ‌و ستافەکەت دروستدەکات کە لەوانەیە هەندێجار پێویست بە بڕیاری قورس‌و سەخت بکات بۆ ئەوانەی ئامادەنین بە قبوڵکردنی نەخشەو پلانەکانت. ئەمەش بەشێکە لە کاری بەڕێوەبەرایەتی چەند زووتر ئەنجامی بدەیت، باشترە.

بۆ دەستپێکی باش وەکو بەڕێوەبەر پاش تەواوبونی کۆبوونەوەکەت لەگەڵ بەرپرسەکەت پێویستە ڕاشکاوانە هەڵوێستی خۆت ڕوونبکەیتەوە، لەگەڵ هاوکارەکانت لە بارەی ئەوداخوازیانەی لە تۆ داواکراون لە کارە نوێیەکەت، ستراتیژیی کارەکەت، تەکنیکی ئەو بەشەی کە تۆ بەڕێوەبەری لەگەڵ چۆنیەتی کارکردن‌و ئەنجام‌و پێشخستنی کارەکەت.

ئەو دەرکەوتنەت وەك بەڕێوەبەر دەبێت جیاوازبێت لەگەڵ ئەو ڕەفتارانەی پێشوت کە بەڕێوەبەر نەبوویت. دەبێت پرسیارو وەڵامەکانت تەواو جیاوازبن، هەوڵبدەیت بەشێوەی پرۆفیشناڵانە قسە لەسەر بابەتەکان بکەیت. زانیاری تەواو لەسەر کارەکەت بەدەست بهێنی‌و هەوڵی بەرەوپێشچونی بدەیت.

پاش تەواوبوونی کۆبوونەوە تێروتەسەلەکەت لە بوون بە بەڕێوەبەر، پێویستە هەنگاوی داهاتووت تێڕوانینێکی بەڕێوبەرانەبێت بۆ ئۆفیسەکەت، داوای زانیاری لە هاوکارەکەنت بکەی بۆئەوەی شتە باش‌و خراپەکانت بۆ دەرکەوێت. زۆربەی بەڕێوبەرە نوێیەکان ئەم هەڵەیە دەکەن لە بەگەڕخستنی گۆڕانکارییە خێراکان بەبێ بەشداری پێکردنی ئەوانەی لە دەوروبەریدان. هەرچەند لە هەندێك کاری تایبەت ئەمە پێویست دەکات، بەڵام لە زۆربەی حاڵەتەکان دەبێتە هۆی جیابوونەوەی تۆ لە کارمەندەکان‌و نەگەیشتن بە ڕاستییەکان، وا لە کارمەندەکان دەکات کە پەراوێزخراون.

بەڕێوەبەری سەرکەوتوو پەیوەندییەکی کراوەو بەردەوام لەگەڵ هاوکارەکانی دروست دەکات، لە هەر پلەیەکدا بن. دروستکردنی پەیوەندی لەگەڵ دەوروبەرەکەت کەشێك لە متمانەو ڕێز دروستدەکات. کاتێك کارمەندێك هەست بە گرنگی خۆی دەکات، ئەوە گرنگی زیاتر بە کارەکەی دەدات لەوەی کە تۆ داوای لێدەکەیت.

قسەیان لە بارەی ئەزمونی تاکەکەسیان لەگەڵدا بکە، ڕوون‌و ئاشکرا داخوازییەکانی خۆتیان پێڕابگەیەنە، ئەو شتەی کە تۆ چاوەڕێی لێیان کە جێبەجێی بکەن. چونکە بەڕێوەبەر ناتوانێت سەرکەوتوو بێت بەبێ زانینی ئەوەی چی لە کارمەندەکانی دەوێت. ئەگەر ڕێزت لە کەسایەتیان گرت کاریگەری تۆیان وەکو ڕابەرو ڕێنیشاندەر زیاتر لەسەر بەجێ دەمێنێت.

سەرچاوە:
http://www.allbusiness.com

ئا: گۆران جەمیل

# دەتەوێت بەڕێوەبەرێکی سەرکەوتوو بیت؟



ئایە دەتەوێت ببیت بە بەڕێوەبەرێکی سەرکەوتوو لە بەڕێوەبەرایەتییەکەتدا؟

بێگومان وەڵامەکەت (بەڵێ)یە، ئەمە تەنیا وەڵامی تۆ نییە، بەڵکو ئەمە وەڵامی هەر کەسێکە کە بەرپرس بێت لە شوێنێکدا، سەبارەت بەم چەمکە قسەو باسێکی زۆر کراوە، وا لێرەدا چەند هەنگاوێك دەخەینەڕوو بۆ بەدەستهێنانی سەرکەوتن لە بواری بەڕێوەبردندا:

١- خۆت بە دوور بگرە لە لووتبەرزی: کە دێیت بۆ سەر کارەکەت وا هەست مەکە کە تۆ باشترین سوارچاکی مەیدانی، هەوڵی دەستگرتن مەدە بەسەر کۆی سیستەمی کاردا، نەکەی بڵێیت: (ئیدی من بەرپرسی سەرەتاو کۆتام)، بە دڵنیاییەوە هەندێ کاروبار هەیە کە دەتوانیت بیگۆڕیت، بەڵام زۆری تریش هەیە کە سەرەڕای ئەوەی کە تۆ پێی سەرسام نیت، گۆڕینی کاری ئەمڕۆو سبەی نییە، بەڵکو بە پێچەوانەوە هەوڵدانێکی زۆری دەوێت.

٢- پەیمانی گەورە مەدە: یەکەم: پێویستە بزانی کە هاوڕێیەتیو دڵسۆزی بە پارە ناکڕدرێت. دووەم: پەیمانێك مەدە گەر دڵنیا نەبیت لە وەی کە دەتوانیت جێبەجێی بکەیت. سێیەم: پێویستە ورد بیت لە هەڵبژاردنی ئەو کەسەی کە خەڵاتی دەکەیت، ئەمە ئەگەر لە کاتێکدا خەڵاتکردن پێویست بێتو بە ڕاستی هەست بکەیت کە پێویستە کارمەندێك خەڵات بکەیت. چوارەم: خەڵاتکردن، لە ڕاستیدا دەبێت بدرێت بە کارمەندێك لە بەرئەو خزمەتەی کە پێشکەشی کردووە، لە ڕابردوودا، یان لە داهاتوودا پێشکەشی دەکات.

٣- ستەمکار مەبە: کاتێك هەڵسوکەوتی ستەمکارانە ئەنجام دەدەیت، ئەمە بەڵگەیە لەسەر لاوازیت نەك بەهێزیت، کاتێك وەك کۆیلە هەڵسوکەوت دەکەیت لەگەڵ کارمەندەکاندا، تۆ بەم کارەت دوژمن بۆ خۆت دروست دەکەیت، پێویستە کە هەڵسوکەوتێکی مرۆڤانە بکەیت لەگەڵیاندا بە شێوەیەکی نەرمونیانو ڕێزدارانە.

٤- بێ لایەنی: لە باشترین خورەوشتەکانی بەڕێوەبەری سەرکەوتوو ئەوەیە کە دادگەر بێت لە هەڵسوکەوتیدا لەگەڵ کارمەندەکانیدا، هەرگیز جیاوازی نەکات لە نێوان کارمەندەکاندا.

٥- بە بێ بیرکردنەوە قسە مەکە: ئەو ژمارە زۆرە لە کارمەند، گوێ دەگرن لە هەر وشەیەك کە لە دەمت دێتە دەر، هەر لە سەرەتاوە وشەکانت کورت بکەرەوە بۆ گەیاندنی مەبەست، چونکە کارمەندەکانتو بەرپرسەکانی سەرەوەت هەرچی هەڵسوکەوتت هەیە تۆماری دەکەن، ئەم کردارانەت دەبێتە وێنەی تۆ لای ئەوان، ڕەنگە تا کۆتاییش لایان بمێنێتەوە.

٦- لە بەرپرسیارێتی ڕا مەکە: لە نیشانەکانی بەڕێوەبەری سەرکەوتوو ئەوەیە کە هەڵەکان دەگەڕێنێتەوە بۆ خودی خۆیو دەسکەوتەکانیش بۆ کارمەندەکانی، چونکە ئەگەر سەرزەنشتی کەسانی تر بکات نەك هەر متمانەیان لە دەست دەدات، بەڵکو وا دەکات کە کەمتر ڕێزی بگرن.

٧- با ئیمتیازی کەسیت نەبێت: وەك بەڕێوەبەرێکی تازە خۆت دەبینیتەوە کە دەتوانی درەنگ بێیت بۆ دەوام، یان لە کاتژمێرێك زیاتر دوا بکەویت لە کاتی نانخواردندا، یان تەلەفۆنی تایبەتی لە نوسینگەکەتەوە بکەیت، ئەوانەو دەیان کاری تریش، بەڵام دەبێت ئەوە بزانی کە هەموو عەیبەکانی بەڕێوەبەرایەتییەکەت بۆ تۆ دەگەڕێتەوە، چونکە تۆ نموونەی زیندووی بۆ ئەو کەسانەی کە لەگەڵتدا کار دەکەن، تۆ بەرپرسی یەکەمو کۆتایی سەرکەوتنو دواکەوتنەکانیت.

وەهاب حەسیب

# زاراوەی کارگێڕی

گۆمانی تێدا نییە زمان کۆڵەکەی بوونی نەتەوەیە، زمانی کوردیش گەرچی زمانێکی دەوڵەمەندە، بەڵام تا ئێستاش شێوەی کۆمەڵگای کشتوکاڵیو شێوە ژیانی دێهاتی پێوەدیارە، سەرەڕای نەبوونی زمانێکی یەکگرتوو کە چارەسەری زۆرێك لە کێشەکانە. بەڵام لاوازی زمانی کوردی لە بواری زانستیو کارگێریو... کێشەیەکی تری بەڵگە نەویستە، کە بۆخۆی ئاستەنگە لە بەردەم تێگەیشتن لە باسو ڕووداوی زانستیو کارگێڕیو... . تەنانەت زۆرێك لە دەرچووانی کۆلێژو پەیمانگاکان پاش تەواو کردنی خوێندنی ئەکادیمیان بە هۆی ناڕوونی دەستەواژە کارگێڕییەکان لایان ئاستەنگی زۆریان دێتە پێش، جا لە کاتی لێکۆڵینەوەو توێژینەوەدا، یان لە وەرگێڕانی باسو ڕووداوە کارگێڕییەکانیان... بێت. ئەم نووسینە هەستکردنە بەو کەموکوڕیانە، بە هیوای کردنەوەی کلاوڕۆژنەیەك لەو بوارەدا:

١- بنەمای لێپرسینەوەی کارگێڕی (مبدء المسائلة الإدارية): بریتییە لە لێپرسینەوەی فەرمانبەر (بەردەست)، دەربارەی ئەو ئەنجامانەی بە دەستی هێناوە لە چوارچێوەی ئەو دەسەڵاتەی پێی بەخشراوەو ئەو بەرپرسیارێتیەی لە ئەستۆیدایە.

٢- داواکاری دامەزراندن، (طلب توظيف): نمونەیەکە بە شێوەیەکی سروشتی لە لایەن ئەو کەسانەوە پێشکەش دەکرێت کە داوای دامەزراندن دەکەن، پاشان داوایی داتاگەلێکی مێژوویان لێدەکرێت، کە لە تواناادا بێت لێکۆلینەوەیان تیادا بکرێت. بەشێوەیەکی ئاسایی بریتین لە زانیاری دەربارەی ئاستی خوێندەواری، شارەزایی، مێژووی کاری پێشووی، ئارەزووەکانیو ئاستی کۆمەڵایەتیو ... .

٣- دەسەڵات (السلطة): بریتیە لە مافی دەرکردنی بڕیار، مافی ئاڕاستەکردنی کەسانی تر لە کارەکانیانداو مافی دەرکردنی فەرمانە.

٤- بودجە: پلانێکە بە بەهای دراو گوزارشتی لێدەکرێت. ئامانجی شتگەلێك ڕوون دەکاتەوە لەوانە: داهات، تێچوونی خزمەتگوزارییەکان، خەرجیو قازانج، بە بەهای دراو گوزارشتیان لێدەکرێت.

٥- ڕیزبەندی فەرمانەکان (سلسلة الأوامر): هەروەها گوزارشتی لێدەکرێت بە ڕیزبەندی هەنگاو بە هەنگاو، یان هێڵی دەسەڵات، بریتیە لەو هەنگاوانەی پێویستە لە گەیاندنی زانیارییەکان، یان ئاڵوگۆڕی زانیارییەکاندا پیادەبکرێت لە نێوان بەرپرسو فەرمانبەراندا لە نزمترین ئاستی نەخشەیی ڕێکخستندا.

٦- پەیوەندی (الإتصال): بریتییە لە ئاڵوگۆڕی زانیاریو گواستنەوەی واتاکان، (واتای گفتوگۆ). تەماشاکە ئەگەر ئەو کەسەی پەیوەندی پێوە دەکەیت لە واتای گفتوگۆکە تێنەگەیشت کە پەیوەندیکەر مەبەستێتی، ئەوا پەیوەندی کاریگەر دروست نەبووە لە نێوان ئەو دوو لایەنەدا.

٧- داهێنان (الإبتكار): بریتییە لە توانای پرۆژە لە داهێنانی شێوازی نوێ لە بەجێهێنانی شتەکاندا، یاخود ڕێگایەکی تازەیە بۆ شیکاری کێشە کۆنەکان.

٨- کلتور (الثقافة): بریتییە لە تۆڕێك باوەڕو بەهای هاوبەش کە هەموو کارمەندان دەزانن بە نیسبەت پرۆژەکەوە کۆتایی پێهاتووە.

٩- ژینگە (البيئة): لە زاراوەی سیستەمدا هەموو ئەو شتانە دەگرێتەوە کە بەلای سیستەمەکەوە گرنگن، بەڵام تا ڕادەیەکی زۆر لە دەرەوەی چوارچێوەی چاودێری سیستەمەکەدان وەك: ڕکابەران کە بەشێکی گرنگی ژینگەیی پرۆژەکە پێکدێنن، پرۆژەکە بە سانایی ناتوانێت دەستیان بەسەردا بگرێت.

١٠- هێزی شارەزا (قوة خبير): هێزێکە لەو ڕاستیەوە سەرچاوە دەگرێت کە تەماشای کەسێکی پێدەکرێت، وەك شارەزا لە بوارێکدا، کارەکەییو گوێ لێگرتنەکەیی لەسەر بنەمایی شارەزاییەکەیەتی، پشتی پێدەبەسترێت لە بواری ئامۆژگاریو ڕاوێژکردندا.

١١. تێربوون ( الإشباع): هەستی ڕەزامەندی تاکە کەسە، پاش ئەوەی ئارەزوو پێداویستییەکانی بە دیدێن، یاخود گەیشتنە بەو ئامانجەی مەبەستێتی.

١٢- ستراتیژییەت: بریتیە لە پلانێکی دوور مەودای هەموو لایەنەکانی ڕێکخراوەکە. بوارەکانی ڕێکخراوەکە دەستنیشان دەکات لەسەر بنەمای ئەو خزمەتگوزاریانەی دواتر پێشکەشی کۆمەڵگای دەکات. ئەو چالاکییە سەرەکیانە دیاریدەکات کە ڕێکخراوەکە پێداگرە

له سەریانو له میانەیاندا ئەو چالاکیو خزمەتگوزاریانە بەدەست دەهێنێتو دابەشی دەکات.

١٣- یەکەی فەرمان: دەقی یەکەی فەرمان لای (هێنری فایۆل) بریتیە: له ڕێژەی هەر هەڵسوکەوتێك کە کەسەکان پێیهەڵدەستن، پێویستە بەردەست (یاریدەدەران) بڕیار تەنها له یەك سەرۆك وەربگرێت.

١٤- ڕەوشتی ستراتیژی: لە - چاودێریدا- ڕەوشتی ستراتیژی ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە ئارەزووی تاکەکانە بۆ ئامادەکردنی زانیاری بە شێوەیەك باشتر دەر بکەون لە ماوەیەکی دیاریکراودا.

نمونە: بەڕێوەبەر چاکردنەوەیەکی داواکراو (پێویست) ڕادەگرێت بە مەبەستی ئەوەی بودجەی چاکردنەوە لە ساڵێك تێنەپەڕێت.

١٥- ڕەوشتی بیرۆکراسی توند: لە چاودێریدا، کەسەکان ئارەزوو دەکەن بە سیمایەکی جوانەوە دەربکەون، بە پێوەرەکانی چاودێری بەو شێوەیە، چونکە بەڕێوەبەر لەسەر بنەمای قازانج هەڵسەنگاندن دەکات، لەوانەیە چاکردنەوەی ئامێرێك پشت گوێبخات چونکە لە کۆتاییدا قازانجی بەشەکەی، یان فەرمانگەکەی زیاد دەکات.

١٦- سیاسات: بریتیە لە کۆمەڵێك بنەما کە پابەندبوونی بەڕێوەبەرایەتیە جیاوازەکان ڕووندەکاتەوە لە ناوچەیەکدا بۆ کارکردنو تەواوکردنی ئامانجە داواکراوەکان لە میانەیی جێبەجێکردنی هەندێ ڕێساو پلانەوە.

١٧- پلان (الخطط): بریتییە لە چەندین ڕێگا، پێشوەخت پێکهێنراوە بۆ تەواو کردنی کارێك. پلان هەمیشە وەڵامی پرسیارێك، یان چەندین پرسیار دەداتەوە، لەوانە: پێویستە چی بکەین، کەی پێویستە دەست بەکاربین، کێ دەبێت ئەو کارە بکات، چۆن بکرێت، بڕو پێوانەی ئەو کارەی تەواو دەکرێت چەندە، بۆچی پێویستە ئەو کارە بکرێت.

١٨- ڕێبەری ڕێکخستن: پێچەوانەی نەخشەی ڕێکخستنە بە گشتگیرو هەمەلایەن تایبەتمەندە، کۆمەڵێك زانیارییە سەبارەت بە کار، دەسەڵات، بەرپرسیارێتی، ئەرکی دیاریکراو بۆ هەریەك لە پۆستی بەڕێوەبردنو پەیوەندی نێوان بەڕێوەبەرایەتییە سەرەکییەکان لە ڕێکخراوەکەدا دیاری دەکات.

١٩- ڕێکخستنی نافەرمی: بریتییە لە پەیوەندی نایاسایی نێوان کەسەکان سەرچاوەکەی دابونەریتو پەیوەندیو ئەو ڕێگایانەیە کە یاریدەدەران شوێنی دەکەون بۆ تەواوکردنی کارەکان.

٢٠- ڕێکخستنی یاسایی: بە پێی پەیوەندییە کارگێڕییەکان بریتییە لە خولانەوە بە دەوری ئەوانەی ناو دەبرێت بە ڕیزبەندی بڕیار، یەکەی فەرمان، ئاراستەکردن.

٢١- هاتووەکان (مدخلات): بریتین لە ڕەگەزەکانی بەرهەمهێنان کە دێنە ناو کرداری بەرهەم هێنانەوە، وەك: سەرچاوەکان (مرۆییو ماتریاڵی)، دراو، تاکەکان، بەڕێوەبردن.

٢٢- دەرچووەکان (مخرجات): ئەنجامی ئەو سەرچاوانەن کە هێنرابوونە ناو ڕێکخراوەکەوەو ڕێکخراوەکە کاری بۆ دەکاتو لە پێناویدا دروست بووە، بریتیە لە شمەك، خزمەتگوزاری، ناوبانگی باش.

23back)-(feed) (التغذیة العکسیة): بریتیە لەو زانیاریانەی بەڕێوەبەر لە شوێنی کار، یان لە فەرمانبەران (بەردەستان) وەریدەگرێت، دەربارەی ئەو بارودۆخەی کارەکەی تیادا تەواو کراوە، یاخود دەربارەی ئەو ڕێگرانەی بەربەستن لە بەردەم جێبەجێکردنی کارەکاندا، پێچەوانەی زانیارییەکانە کە لە خوارەوەی پەیکەری ڕێکخراوەکەوە دەردەچێت.

٢٣- بەڕێوەبردن بە هاوبەشی (الإدارة بالإشتراك): شێوازێکی دیموکراتییە لە بەڕێوەبردندا پشت دەبەستێت بە لۆژیکی ڕاوێژو بەشداری پێکردنی بەردەستان لە دەرکردنی ئەو بڕیارانەی پەیوەستن بە بەشەکانیانەوە.

٢٤- جێگۆڕکێ لە شوێنی کاردا (التدویر الوظیفي): بە مەبەستی زاڵبون بەسەر بێزاری فەرمانبەر لە کارەکەیدا، کارمەند کارێکی دیاریکراو ئاسانی پێدەسپێردرێتو پاش ماوەیەك دەگوێزرێتەوە بۆ جێگایەکی تر، شێوازێکە کۆمپانیاکان پیادەی دەکەن لە دیزاینی کارەکانیاندا بە مەبەستی شارەزایو لێهاتویی زیاتری فەرمانبەر لە کارەکەیدا، بە مەبەستی ڕووبەڕووبوونەوەی دۆخی نائاسایی سەرەڕای دوورکەوتنەوە لە بێزاریو وەڕسبوون لە کار.

٢٥- پەیوەندی کەسی (الإرتباط الشخصي): بریتییە لە پەیوەندی کەسێك پشت ئەستورە بە یەکێك لە بەشەکان، کاری سەرەکی بریتییە لە دامەزراندنی ڕێکخستنی چالاکی لە نێوان بەشەکەیو بەشێکی کەدا. نموونە: کەسێکی باوەڕپێکراو لە بەشی فرۆشراوەکان بە شێوەیەکی خول دەڕوات بۆ کارگەیەکی بەرهەمهێنان بە مەبەستی زانینی هەندێ شت کە لە خشتەی بەرهەمهێناندا لە بیرکرابوو، بە مەبەستی دڵنیایی ڕێکخستن لە نێوان بەرهەمهێنانو فرۆشتندا.

٢٦- لێکۆڵینەوەی زانستی (بحوث العلمي): واتا لێکۆڵینەوەی زانستی وەك ئامرازێك بەکاربهێنرێت بە مەبەستی دەرکردنی بڕیار بەسەر گۆڕاوەکاندا کە لە تواناندا هەیە بۆ چارەسەری کێشەیەکی دیاریکراو بەکاربهێنرێت لە میانەی پێوانەو بەکارهێنانی نمونەی بیرکاری. کاتێك لێکۆڵینەوەی زانستی بەکاردەهێنرێت لە سەر بناغەیی ئەم چوار توخمە: ڕێگای زانستی، پێوانەی بیرکاری، ڕێگای نمونەیی (باشترین ڕێگا)، ئامانجەکان.

٢٧- بەجێهێنان (الإجراءات): ژمارەیەك کار، یان هەنگاوی یەك بە دوای یەکە کە ئامانجی تەواوکردنی کارێکی دیاریکراوە.

٢٨- بنەماکانی بەڕێوەبردن (مبادیء الإدارة): ڕابەرانی قوتابخانەی کلاسیکی وەك (فردریك تایلۆر، هێنری فایۆل) لە نووسینەکانیاندا بۆچوونەکانی خۆیان کورتکردۆتەوە دەربارەی بنەماکانی بەڕێوەبردنی نوێ، وەك: پێویستە هەر سەرپەرشتیارێك چالاکییەکی پسپۆری پێبدرێتو سەربەخۆ بێت تا بتوانێت تەواوی بکات.

٢٩- بەرپرسیارێتی کۆمەڵایەتی (المسؤلیة الإجتماعیة): بریتییە لە ڕۆڵێك کە دامەزراوەکان دەیبینن لە دۆزینەوەی ڕێگەچارە بۆ کێشەی کۆمەڵایەتیو کێشەی کۆمەڵگاکان، وەك دامەزراندنی کەمینەکان... تاد.

٣٠- هاندان (الدافعیة): ئاماژەیە بە ئاراستەی تاك بۆ بەدەستهێنانی ئامانجێك، زۆرێك لە ڕەفتارەکان (ئەوانەی هەڵسوکەوتی تاك لە سەر بنەمای ڕەفتار هەڵدەسەنگێنن) باوەڕیان وایە هاندان لە سەر بنەمای ناجێگیری ناخ دروست دەبێت کە ڕەنگدانەوەی تێرنەبوونی پێداویستییەکانە، ڕەوشتی هاندراویش هەوڵدەدات بۆ کەمکردنەوەی ئەو جۆرە ناجێگیرییە.

ئەسکەندەر ڕەحیم

# بزمارە کارگێڕییەکان



بزمار لای هەمووان ئاشنایەو کێ هەیە نەزانێت بزمار چییە؟ بگرە دەشزانین، سوودێکی زۆری هەیەو خەڵکی بۆ زۆر مەبەستی جیاواز بە کاری دەهێنن.. وەك: هەڵواسین، پێکەوە بەستنی شتەکان... هتد. بزماریش لە دیواردا کەڵکی نابێت، ئەگەر بە باشی دانەکوترێت. بەڵام بزماری کارگێڕی بەو چەشنە نییە.. کەواتە بزماری کارگێڕی چییە؟!

ئەوانەی لە دەستەیەکی کاردا کار دەکەنو کارێك ڕادەپەڕێنن.. ئیدی چەشنی کارەکە هەرچییەك بێت. ئەم دەستەیەش چ پیشەیی، چ کۆمەڵایەتی، چ وەرزشی، یان هونەری بێت.. هەروەها دەستەکە سادە بێت، یاخود ئاڵۆز.. هەموو ئەمانە زاراوەی بزمارە کارگێڕییەکان دەیانگرێتەوە.

ئەگەر بە سادەیی بزماری کارگێڕی بناسێنین.. ئەوا دەڵێین: بریتییە لە دەسەڵبەستی کارگێڕی، یان بە ڕەواو ناڕەوا گازندەو سکاڵای ژێربەژێرو کتوپڕ. بە مانای گازندەو پرتەو بۆڵەی ئەندامێکی دەستەکە، یان چەند ئەندامێکی.. لە دژی ئەندامێکی دیکەی دەستەکە، یاخۆ لە دژی کۆمەڵێك لە ئەندامان، بێئەوەی پێشتر ئامۆژگاریو ڕێنوێنییان کردبێت.. ئەویش بەوەی کەسێك لە ڕێگەی خۆمەڵاسدانەوە بۆ هەڵەکانی کەسانی دیکە، هەروەها لە ڕێگەی بە نێچیرگرتنی نەنگیو شوورەییەکانیانو گەیاندنیان بە بەڕێوەبەرەکەی، یا بەرپرسەکەی دەبێت، تا وێنەی کەسانی دیکە، لە هزروهۆشیدا بشێوێنێتو ڕەزامەندی، یاخود ڕێزلێنانێکی بەڕێوەبەرو بەرپرسەکەی بە دەست بهێنێت.

ئەم ڕەفتارەش، تەنها کەسە نەخۆشەکان پێی هەڵدەستن، مەبەستم لە نەخۆشەکان ئەوانەن کە دڵیان نەخۆشەو پڕە لە ڕقو قینەو چاوچنۆکیو بە قوربانیدان لە کەسانی دیکە خۆیان دەردەخەن. سا ئەگەر بزمارە کارگێڕییەکەی بە هەق بوو، ئەوا بۆ خۆی گرفتێکە.. خۆ ئەگەر بە ناهەقیش بوو، ئەوا گرفتەکە گیرترو گەورەترە.

جێی سەرنجەکە لە یەکچوونێکی خۆرسك لە نێوان بزماری ئاساییو بزماری کارگێڕیدا هەیە. بزماری ئاسایی، مرۆڤ بۆ مەبەستە ئاساییەکانی خۆی بەکاری دەهێنێتو سەرباری ئەوەی سوودیشی هەیە، بەڵام کاتێك بە دیواردا دایدەکوتیتو هەڵی دەکەنیتەوە، کەل دەخاتە ناو دیوارەکەو دەیڕوشێنێت.. بە چەشنێك هەرچەندە چاکی بکەیتەوەو کونو کەلێنەکەی پڕ بکەیتەوە، ئەو شوێنەوارەی هەر دەمێنێتەوەو دەبێت بە بەڵگەیەك لەسەر ئەوەی ئەو جێگەیە، بزماری پێدا داکوتراوە. خۆ ئەگەر لە بزماری کارگێڕی بڕوانین.. دەبینین، دڵی ئەو کەسەی گازندەی لێکراوەو شوورەییو نەنگییەکەی دەرخراوە.. ئەگەرچی بە دواشیدا هەوڵی ئاساییکردنەوەی پەیوەندییەکان بۆ دۆخی ئەوسای بدرێتەوە.. هەروەك شوێنەواری بزمارە ئاساییەکە ڕووشاوە.. بەڵام بزمارە کارگێڕییەکان، لە دەفتەری یادگارییە تاڵەکاندا هەر دەمێننەوە.

گرفت لە نێوان ئەندامەکانی هەر دەستەیەکدا هەیەو ئەمەش ڕەوتی ژیانە.. بەڵام زۆر جوان دەبێت، ئەگەر لە پاڵ ئامۆژگاریو ڕێنوێنیدا، گازندە لە ڕێگەی تابلۆ فەرمییەکانەوە ڕێکبخرێت.. جوانتریش دەبێت ئەگەر ئەم گوفتارە جوانەی لەگەڵدا بێت: بۆی دامەچۆ.. هەمووان دەکەوینە ناو هەڵەوە.

زۆر زۆر جوانیش دەبێت، ئەگەر بە چاوی کەمەوە، لەو کەسەی هەڵەی کردووە، نەڕوانین.. بەڵکو پێویستە هەموومان ببین بە گیانێك لە یەك جەستەداو ئەگەر ئەندامێکمان ئازارێکی تووش هات، ئەوا هەموو جەستەمان، خەوی لێ بتۆرێتو بۆی بێتە کوڵ.. چونکە لە پشت هەر کارێکی سەرکەتوو.. لات ڕوون بێت دەستەیەکی سەرکەوتوو هەیە.

گ. داودی

# مافەكانی تۆی منداڵ



منداڵانـــی ئازیـــز، ئێـــوەش هەروەكو هەموو چینو توێژەكانی كۆمەڵگە خاوەنی مافو پێویستە هەموو مافەكانتان بۆ دەستـەبەر بكرێت، هەر بۆیە بۆ ئاشـنابوونو بیرهێنانەوەتان بە مافەكانتان لە بڕگەی ئەمجـارەدا چەند مافێكی ئێـوەی ئازیز دەخەینـەڕوو، بەو هیوایـەی هەمـوو مافەكانتان بۆ دەستەبەر كرابێت:

**مافی ڕێزگرتن:**

تـۆ مافـی خۆتـە كە لـە ناو كۆمەڵێكـدا بژیـتو خۆشـیان بووێیـتو بە باشـی بایەخت پێ بـدەنو ڕێـزی هەسـتو ژیانـی تایبەتـت بگـرن، كـە ئەوانیـش كەسوكارەكەتو خێزانەكەتن.

**مافی یەكسانی بوون:**

كچ، یـان كـوڕ، چ كەمئەندام بیت، یان لەشسـاغ، ڕەنگی پێستت هەرچی بێت، یان بە هەر زمانێك قسـە بكەیـت، تۆ لــە مافەكانتدا یەكسانیت.

**مافی چاودێریكردن:**

ئەگـەر بریندار بوویـت، یان تووشـی نەخۆشـییەك بوویـت، دەبێـت بایەخـت پـێ بدرێـت، ئەگەر پێویسـتی كرد مافی خۆتە سەردانی دكتۆر بكەیت، یان بڕۆیت بـۆ نەخۆشـخانە بـۆ وەرگرتنی چارەسەر.

**مافی ناسنامە:**

كـە لـە دایـك بوویـت مافی خۆتە كـە ناوێكی شایسـتەت لێ بنرێت، ناسنامەت بۆ دەربكرێتو ڕەگەزنامـەت هەبێـت، ئەمـە بۆئـەوەی لـە دواڕۆژدا بتوانیـت بڕۆیتـە قوتابخانـەو چاودێـری بكرێیتو كوتانت بۆ بكەن.

**مافی خستنەبەر خوێندن:**

هەموو منداڵێك مافی خۆیەتی كـە بخرێتە بـەر خوێنـدن، بە مەبەسـتی فێربوونـی خوێندنو نووسـین. نـەك كاركـردن لـە سـەر شـەقامو كارگەو كێڵگەكان، چونكە شـوێنی تۆ سـەر كورسی قوتابخانەیە.

**مافی خواردن:**

مافـی خۆتـە كـە خـواردنو خواردنـەوەت بۆ دابیـن بكرێت، بۆئەوەی تەندروسـتییەكی باشت هەبێتو گەشـەكردنت بـەردەوام بێت.

**مافی پاراستنت لە توندوتیژی:**

هیچ كەس مافی ئەوەی نییە كە لێت بدات، یان بە خراپ هەڵسوكەوتت لەگەڵدا بكات، یان جەسـتەت بەكار بهێنێتو سـووكایەتیت پـێ بكات، مافـی خۆتە كە بە ئاشـتی بژیتو دوور بیت لە شەڕو ئاژاوە.

**مافی یاریو پێكەنین:**

هەندێ لە گـەورەكان ئەوەیان لـە بیر چووەتەوە كە تۆ هێشـتا منداڵـی، وەك هـەر منداڵێكی تر مافی یاریكردنو پێكەنینو خەون بینینت هەیە.

ئا: ئیبراهیم مستەفا خدر



# CRM و کۆمەڵگاکەمان

(CRM) شێوازو ستاندارێکی بازاڕسازییە کە بە هۆیەوە ڕێکخراو کڕیار دەدۆزێتەوە، ئینجا هەوڵ دەدات کە هەمیشە پارێزگاری لەو کڕیارە بکات، تاکو ئەو کڕیارە ببێتە کڕیارێکی ڕاستەقینەو هەمیشەیی بۆ ڕێکخراوو بەرهەمەکانی.

بێگومان ئێوەش بیستووتانە کە دەڵێن: "هەمیشە ماف، مافی کڕیارە". واتە هەمیشەو لە هەموو کات دەستکەوتو ماف لەگەڵ کڕیارەوە دەبێت کە ئەویش بە گرنگترین بنەمای CRMدادەنرێت.

(CRM) دەتوانێ هۆکاری پەرەپێدانو زیادکردنی بەرهەمە فرۆشراوەکانو مانەوەی ڕێکخراو لە دنیای بازرگانی بێت، چونکە بەکارهێنەر لە بەرهەم، خزمەتگوزاری، چۆنیەتی هەڵسوکەوتکردنو نرخەکانی ئێمە ڕازییەو ئەوە بە واتای پێشکەوتنو بەردەوامبوون لە کرداری بەرهەمهێنان بە هۆی بەکارهێنەرو کڕیارەکانەوە دێت.

ئەمڕۆ (CRM) لە زۆربەی کۆمپانیاو ڕێکخراوەکان، بازاڕگە، سوپەرمارکێتو شوێنەکانی تر بەکاردێت، هەندێ لە ڕێکخراوەکان ئەو پلانە بە شێوەیەکی فراوانو بە بوودجەیەکی یەکجار زۆر دەخەنە بواری جێبەجێکردنو کارپێکردنو هەندێ لایەنی تر تەنیا پشت بە بنەمای قسەکردن (قسەی خۆش) دەبەستن، بەڵام بە داخەوە بارۆدوخی کۆمەڵگای ئێمە ئەو شتانە ڕەچاو ناکات.

لە کۆمەڵگای ئێمەدا، کڕیار ناتوانێت لەو کاتە کە بەرهەمو خزمەتگوزاری بە کوالێتییەکی خراپو نرخێکی بەرز دەگاتە دەستی داوای مافی خۆی بکات، لەگەڵ ئەوەشدا کڕیار دڵنیا نییە کە لە لایەن فرۆشیارەکان متمانەی پێ بدرێت کە هەمیشە مافی ڕەچاو دەکرێتو بە نەبوونی ئەو (کڕیار) فرۆشیاریش ناتوانێت بەردەوام بێت لە کارکردندا!

بە لێکدانەوەی بابەتی سەرەوە دەتوانین بڵێین کە گرنگیدان بە کڕیار لە وڵاتی ئێمە چەمکێکی بێ واتایەو بەڕێوەبەرانی ڕێکخراوو کۆمپانیاکان بە شێوەیەکی سەرەکی باوەڕیان پێ نایەتو لەوانەیە گرنگترین هۆکارەکانی ئەو هەژارییە کە لە شێوازی بیرکردنیان هەیە لەو خاڵانەی خوارەوە کورت بکەینەوە:

١- پشت بەستن بە شێوازەکانی بازرگانی کۆنو دابو نەریتی کۆنو وەرنەگرتنو قبوڵ نەکردنی پێداویستی کۆمەڵگاو دنیای بازرگانی بە سوودوەرگرتن لە شێوازەکانی نوێو پێشکەوتوو.

٢- نزمبوونەوەی کوالێتیو چەندینەیی خزمەتو بەرهەمەکانو نەبوونو دەرفەت نەدانی هێزی هەڵبژاردن بە کڕیار بۆ دابینکردنی پێداویستی ڕاستەقینە لە لایەن ڕێکخراوەکان.

٣- نەبوونی بەشی چاودێرییەکی دادپەروەرو وردبین.

لە زۆربەی حاڵەتەکان پیاوانی دەسەڵاتدارو بەڕێوەبەرانی ڕێکخراوەکان

هـەوڵ دەدەن ڕاسـتییەکان لـە پشـت هۆکارەکانـی یەك لایەنەو نادروسـت وەك ئەندام نەبوون لە ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان وەك ڕێکخراوی بازرگانی جیهانی بشارنەوە، کە لە هەمـان کاتدا هـەر وڵاتو هەرێمێك دەتوانێـت بە بـێ ئەندام بـوون لەو جۆرە ڕێکخراوانـە وەك ڕێکخـراوی بازرگانـی، یـان گومرگـی جیهانـی لە ناوخـۆی وڵات بازرگانییەکـی سـەرکەوتووی هەبێتو ڕێز لە مافو دەسـتکەوتەکانی کڕیارەکانی خۆی بنێت، هەروەها بۆ باشترکردنی شێوازەکانو لابردنی سـێ هۆکاری سـەرەوە جووڵەیەکی دروسـت ئەنجـام بـدات. بە شـێوازێکی تر ڕێزلێنان لە کڕیـارو گرنگیدان بە کڕیار بە هیچ شێوەیەك پەیوەندی بە ئەندام بوون لە ڕێکخراوەکانی چاودێریو جیهانییەوە نییە.

متمانـە نەبوون بە هێـزی بازرگانی مۆدێرنو ڕازیبوون بـە مانەوە لە هەمان بازاڕی کۆنی چەند سـەد ساڵەی ڕابردوو نە تەنیا چارەسـەری ئەو کێشەیە ناکات، بەڵکو فرۆشیار تەنها بۆ ماوەیەکی زەمەنی کورت قازانج دەکات، چونکە ئەو هەر بیر لە شـێوازە کۆنەکان دەکاتـەوەو ناتوانێت وەڵامی پێداویسـتی ژیانی ئێسـتا بە پێی پێشکەوتنەکانی تەکنەلۆژیا بداتەوە.

لـە توێژینـەوەو چاوپێکەوتنەکان بە زۆری بـاس لـەوە دەکرێـت کـە هەرزان فرۆشتن باشترین ڕیکلامە کە دەکرێ، ئەم قسەیە هەروەك ترس لە ڕووبەڕووبوونەوە بـە بازرگانـی مۆدێـرن لێـك بدرێتەوە. ئێسـتا کە ئێمە باوەڕمان بە ڕیکلام کردن نییەو خۆمان لە بانگەوازی ڕۆژنامەوانیو چاپکردنی ئـاگاداریو بانگەوازیو... هتد، دوور دەخەینـەوە، چۆن دەتوانین ماف بە کڕیارەکانی خۆمان بدەین، لە هەمان کاتدا یەکێـك لە گرنگترین بنەماکانی بازرگانی سـەرکەوتوو بە شێوازی مۆدێرن لە دنیای ئەمڕۆ ڕێزگرتنە لە کڕیارەکان.

سـەبارەت بە خاڵـی دووەم کە هەمان نزمبوونەوەی ئاستی کوالێتیو چەندینەیی خزمەتگـوزاریو بەرهـــەمو نەبوونـی توانای هێـزی هەڵبژاردنە بۆ دابینکردنی پێداویسـتی ڕاسـتەقینەکانی کـــڕیار، دەتوانین بڵێین کە فێڵ کردنێکە کە تەنیا لە شـێوازی بیرکردنو دەسـتەبەرکردنی قازانجی کاربەدەستانی لایەنە جیاوازەکان سـەرهەڵدەداتو دەبێ بە ڕاستی نیگەرانی ئـەو کۆمەڵگایـە بیـن کـە ئەو شـێوازە بیرکردنەوەیان هەیە.

لەوانەیە ئەوە نادروسـتترین شێوازی ڕێزلێنـان لە کڕیارەکان بێـت، کاتێك کە ڕێکخراو، یـان کۆمپانیایەك تەنیا بیر لە قازانجکردنو حیسـابی بانکـی خۆی (کە هەمیشە باڵانسی بەرزی هەیە) دەکاتو لە جیاتی بە دەسـتهێنانی ڕەزامەندی کڕیار بیر لە شـوێنی خۆیان لە بازاڕی پشکەکان دەکەنو لە لایەکی ترەوە بە باشی دەزانن کـە ئەوان تەنیا لایەنـی دابینکردنی ئەم خزمەتگوزاریو بەرهەم هێنانەن، تەواوی هەوڵـی خۆیان دەدەن کە هەر بە تەنیایی بمێننـەوە. بـە دڵنیاییـەوە هیـچ جۆرە ڕێزێك بۆ کڕیاری خۆیان دانانێن. کەواتە بە هەسـتکردن بەوەی کـە کڕیار چ حەز بـە پەیوەندیکردن لەگـەڵ من بکات، یان نەکات، بۆ پاراستنی ڕێسای ژیانی ڕۆژانەو دەسـتەبەرکردنی پێداویستییەکانی خۆی دەبێ ڕوو لـەو دابینکەرانە بکات کوالێتی بەرهەمـەکان کەمتـرو نزمتـر دەبێتو لـە ئەنجامـدا لـەو شـوێنانە کـە دەبێ بەرهەمهێنان بەرز بکرێت، نزمتر دەبێتو لەو شـوێنانەش کـە بەرهـەم دەبێ کەم بکرێت بنمیچو سـنوورەکان دادەبەزێنو نرخـەکان دوور دەکەوێتـەوە لـە نرخی ڕاستیو دادوەری خۆیانو ڕەزامەندی کڕیار بۆ هیچ لایەنێك گرنگ نابێت.

هۆکاری سێیەمیش یارمەتی هۆکارەکانی تر دەدات. چاودێـریو کۆنتڕۆڵ کردنێکی سـەرکەوتووانە لـە لایـەن بەرپرسـانی دەوڵەتییـەوە نییە، یان ئەو کەسـانە کە ڕۆڵی پسـپۆڕ لە ڕێکخراوەکانی چاودێری دەبینـن تواناو هێزو تەکنیكو پسـپۆڕی تەواویان نییـەو لە زۆربـەی حاڵەتەکان بەرگری لە فرۆشیارەکان دەکەن!!!!

ئێسـتا کاتێك کە وشـەی "هەمیشـە مـاف، مافـی کڕیـارە" تەنیا لـە گۆڤارو پەرتووکەکانـی بـــازرگانـی مۆدێـرنو تەکنەلۆژیـای زانیـاری دەبینرێت، ئینجا کە بۆ کڕیـن دەچینە سـوپەرمارکێتێکی گەورەو مۆدێرن، بەڵام فرۆشـیار تەنانەت وەڵامی سـڵاوی ئێمە ناداتـەوە، دەبێ ئەو پرسیارە لە خۆمان بکەین ئیتر کەی ماف، مافی من دەبێت؟؟؟؟؟!!!!!

تێبینـی (CRM) بە واتایی کارگێڕی (پەیـوەندی کـــڕیار) (CUSTOMER RELATIONSHIP MANAGEMENT).

# بە کارهێنانی کارتی کار، وەك ئامرازێکی بازاڕسازی

لێـرەدا چەنـد خاڵێـك دەخەینـە ڕوو، بۆئـەوەی کارتـی کارەکەت ببێت بـە مایەی جوڵاندنی بازاڕی کارت.. ئەوانیش:

١- هەمیشـە کارتـی کاری زیـادە لـە جانتاکەتدا هەڵبگرە.

٢- کارتی کارەکەت، بە تابلۆی ڕاگەیاندنەوە هەڵبواسە.

٣- لە سەروبەندی ئاهەنگو کۆبونەوەکاندا، کارتی کارەکەت دابەش بکە.

٤- لەگـەڵ ئاشـناو دۆسـتەکانتدا، کارتی کارەکانتان ئاڵوگۆڕ بکەن.

٥- بڕێـك لە کارتـی کارەکەت، بەسـەر ئەندامانی خێزانەکەتدا دابەش بکە، تا بەسەر هاوڕێو ئاشناکانیاندا دابەشی بکەن.

٦- هـەر کاتێك چاوت بە چەند کڕیارێك دەکەوێت، کە پەسـەندی کارەکەی تۆ دەکەنو پێـی ڕازیـن، ئـەوا ژمارەیـەك لـە کارتـی کارەکەتیان پێ بدە، تا بەسەر ناسراوو کڕیارو هاوڕێیەکانیاندا دابەشی بکەن.

٧- کارتـی کارەکـەت بـۆ ئـەو گۆڤـارو ڕۆژنامانەی بانگەشەی بازرگانی دەکەن بنێرە.

٨- بـە جۆرێك نەخشەسـازیی بـۆ کارتی کارەکەت بکە، کە سەرنجڕاکێش بێتو با سەرجەم زانیارییە گرنگەکانیش لە خۆ بگرێت.

٩- کارتی کارەکەت لە لای ئەو کەسـانەی سەردانیان دەکەیت – وەك: پزیشك، ئەندازیار، بازرگان... هتد- بەجێ بهێڵە.

١٠- ئەگـەر ئەندامـی ڕێکخراوێکـی پیشەییت، لە ژووری پرسگەو پێشوازی بپرسە: ئایـا دەتوانـم کارتـی کارەکەم، لە تەنیشـت بڵاوکراوەو بانگەشە بازرگانییەکاندا دابنێم؟

١١- ئامـادەی ئـەو کـۆڕو کۆبوونەوانەی تایبەتن بە کارەکەت ببەو کارتی کارت بەسەر هەمووواندا دابەش بکە.

١٢- لە کاتی ناردنی هەر پۆستێکدا، کارتی کارت لەگەڵیدا بنێرە.

## لێدوانەکانی کۆتلر لە بازاڕسازیدا

هاژە شێروانی

بەشی پێنجەم

# دوو ڕوانینی هەڵە لەسەر بازاڕسازی

لەم زنجیرەیەدا هەوڵدەدەین کە دوو ڕوانینیی بەربڵاو لەسەر بازاڕسازی بۆ خوێنەرانی بەڕێز بخەینە ڕوو، کە لە هەمان کاتیشدا هەڵەن، ئەوانیش بریتین لە:

**١- بازاڕسازی فرۆشتنە:** یەکێك لەم جۆرە بەڵایانەی کە زۆر بەربڵاوە ئەوەیە کەوا بڕوانێت لە بازاڕسازیو فرۆشتن لەوەی کە هەردووکیان یەك شتن، کە ئەمەش بە تەنها ڕوانینی زۆرێك لە خەڵك نییەو بەس، بەڵکو ڕوانینی پیاوانی کاریشە. کە بە بێگومان فرۆشتن بەشێکە لە بازاڕسازی جگە لەوەی کە بازاڕسازی شتگەلێك دەگرێتەوە لە فرۆشتن. هەروەك پیتەردراکەر تێبینی ئەوەی کرد کە: «ئامانجی بازاڕسازی ئەوەیە کە وابکات فرۆشتن شتێکی زیادە بێت»، ئەوەی کە دراکەریش مەبەستیەتی کە ئەرکی بازاڕسازی بریتییە لە دۆزینەوەی ئەو پێداویستیانەی کە پڕ نەکراونەتەوە. چارەسەری گونجاویشی بۆ بدۆزێتەوە کاتێك کە بازاڕسازی زۆر سەرکەوتوو دەبێت، ئەو کاتە خەڵك بەرهەمی نوێیان خۆشدەوێتو ئەم خۆشەویستییەش بە خێرایی بڵاودەکرێتەوە لە ڕێگای گواستنەوەی، لە دوایشدا کەمێك لە فرۆشتن پێویست دەبێت.

بازاڕسازی یەکسان نابێت بە فرۆشتن، چونکە بازاڕسازی دەستپێدەکات ماوەیەکی زۆر بەر لەوەی کە کۆمپانیا بەرهەمی هەبێت. بازاڕیش ئەرکێکی ناوماڵە کە پێویستە بەڕێوەبەران پێی هەڵبستن بۆ دیاریکردنی پێداویستییەکانو پێوانەکردنی ماوەو چڕیەکەی، دیاریکردنی ئەگەری بوونی دەرفەتی قازانجداری. کە فرۆشتن ڕوودەدات تەنها دوای دروستکردنی بەرهەمەکە. هەرچی بازاڕسازییە ئەوا بە درێژایی تەمەنی بەرهەمەکە بەردەوام دەبێتو هەوڵدەدات کە کڕیاری نوێ بدۆزێتەوەو ڕاکێشانی بەرهەمو پەرەدان بە ئەداکەی، لە دەرەنجامی فرۆشتنی بەرهەم فێردەبێتو فرۆشراوە گەڕاوەکان بەڕێوە دەبات.

بازاڕەکانیش ڕەخنە لە بەڕێوەبەرەکانی پێش خۆیان دەگرن بەوەی کەوا سەیری بەڕێکراوەکانی بازاڕیان نەکردووە کە وەبەرهێنانە نەوەکو تێچوون، لەبەرئەوەی کە تیشك دەخەنە سەر دەرەنجامەکان لە ماوەی کورتخایەن، نەوەکو تیشك خستنەسەری لە ماوەی درێژخایەن، لە کۆتایشدا لەبەرئەوەی حەز بە ترسناکی ناکەن.

**٢- بازاڕسازی لە بنەڕەتدا بریتییە لە کارگێڕی:** ڕوانینێکی تری کەمتەرخەمی بازاڕسازی بریتییە لەوەی کە بازاڕسازی لە بنەڕەتدا بریتییە لە کارگێڕییەکی تر لە کارگێڕییەکانی کۆمپانیا. ڕاستە کە کۆمپانیاکان کارگێڕییان هەیە بۆ بازاڕسازی کە زۆرێکیشیان بیرکردنەوەی بازاڕسازییان تێدایە. بەڵام ئەگەر هاتوو کاری بازاڕسازیو ئاڕاستەکانی تەرخانکرا بە تەنها لەم کارگێڕییەدا، ئەوا کۆمپانیا بە شێوەیەکی خراپ دەردەخات، لەوانە بێت کە کۆمپانیا گەورەترین کارگێڕی بازاڕسازیو فرۆشتنی هەبێت لە بواری کارەکەی، بەڵام هەرەس دەهێنێت لە بازاڕ. هەر وەك (دیفید پاکارد) هاوەڵی دامەزرێنەری کۆمپانیای (هیولیت پاکارد) بە ئاقڵانە دەڵێت: «بازاڕسازی گرنگە بە پلەیەك کە بە تەنها جێبهێڵرێت بۆ کارگێڕی بازاڕسازی»، کە هەر کارگێڕییەك دەتوانێت مامەڵە لەگەڵ کڕیار بکات بە شێوەیەکی باش، یان خراپ، کە ئەمەش کاریگەری دەکاتە سەر ئارەزوومەندی لە مامەڵەکردن لەگەڵ کۆمپانیا لە ئایندەدا. لەوانەیە کڕیار تەلەفۆن بکات بۆ کۆمپانیاو بە ئاستەمی زانیاری دەست بکەوێت، یان بگات بە کەسی دیاریکراو، لەوانەشە بەرهەمی داواکراو بگات بە دەستی کڕیار بە شێوەیەکی، یان لە بارێکی وێران، چونکە ئاستەکانی دروستکردنی ڕێکنەبوون، یان ئەوەتا پێچەوانەی خراپە، یان لەوانەیە بەرهەمەکە درەنگ بگات بە دەستی کڕیار لە وادەی دیاریکراو، لەبەر زانیاری هەڵەو ناتەندروست لەسەر گەنجینەکان، لەوانەشە پسووڵەدان کڕیار تووشی شۆك بکات، چونکە کارگێڕی ژمێریارییەکەی ڕسوماتێکی ناڕوونی خستۆتەسەری. هەموو ئەم شکستهێنانە ڕوودەدەن کاتێك کە کارگێڕییەکانی تر تیشك ناخەنە سەر ڕەزامەندی کڕیار.







# کێبڕکێی نێوان کۆمپانیا زەبەلاحەکانی جیهان

کێبڕکێـــی نێــوان کۆمپانیا زەبەلاحەکانی جیهان بۆ داهێنان لە ئامێرە نوێیەکانـــدا پەنایان بردووە بۆ بەرزترین تەکنیکی نوێ، بۆیە زیاتر پەنادەبەن بۆ (بچووککردنەوەی قەبارە– هونەری سەرسوڕهێنەر– بەکارهێنانی شوێنی داتا نوێکان، هەموویان هەستیار بن بە لەمس کار بکەن) بۆیە کۆمپانیا زەبەلاحەکان هەســتان بەپێشکەشــکردنی ئامێرە نوێیەکانیان کۆمپانیای (Motorola Xoom- HP Touch Apple I pad٢– Pad– Black Berry play book).

| | Apple iPad 2 | Motorola Xoom | HP TouchPad | BlackBerry PlayBook |
|---|---|---|---|---|
| |  |  |  |  |
| Platform | iOS 4.3 | Android 3.0 | webOS 3.0 | BB Tablet OS (QNX) |
| Display | 9.7-inch LED-backlit IPS LCD | 10.1-inch | 9.7-inch | 7-inch LCD |
| Resolution | 1024 x 768 | 1280 x 800 | 1024 x 768 | 1024 x 600 |
| Processor | 1GHz dual-core Apple A5 | 1GHz dual-core NVIDIA Tegra 2 | 1.2GHz dual-core Qualcomm Snapdragon | 1GHz dual-core Cortex-A9 |
| Memory | ? | 1GB RAM | 1GB RAM | 1GB RAM |
| Storage | 16GB / 32GB / 64GB | 32GB | 16GB / 32GB | 16GB / 32GB / 64GB |
| Front camera | VGA | 2 megapixel | 1.3 megapixel | 3 megapixel |
| Rear camera | 720 / 30p video | 5 megapixel AF with dual-LED flash, 720 / 30p video | none | 5 megapixel, 720p video |
| Cellular radio | EDGE plus quadband HSPA or CDMA / EV-DO Rev. A | 3G with free upgrade to 4G LTE | 3G and 4G | 3G and 4G |

١-ئەوەی بەدیدەکرێت لە ئەم ئامێرانەدا (پرۆگرامە)، بۆ نموونە ئەوانەی بە پرۆگرامی (ئەندرۆید) کاردەکەن پرۆگرامیان لە جیهاندا کەمترە لە پرۆگرامەکانی کۆمپانیای (ئەپڵ)، (ئەندرۆید) ١٥٠٠٠هەزار پرۆگرامی هەیە لە جیهاندا. (ئەپڵ) (iOS) ٦٥٠٠٠ پرۆگرامە.

٢-هەندێکیان گەیاندنی تایبەتمەندییان هەیە، وەکو (HDMI-SD Card- USB) بەڵام ئەوانەی کۆمپانیای ئەپڵ ئەم تایبەتمەندییانە ڕاستەوخۆ نین، دەبێت بە پارچەی هاوکاری پەیوەستی بکەین.

٣- لــە ڕووی تەکنیکــەوە (IPAD2) لە هەموویــان بەهێزترە، بەڵام لە ڕووی جێبەجێکردنی ئەرکــەوە (Motorola Xoom) لە هەموویان خێراترە.

٤-لە ڕووی قەبارەوە (Black Berry play Book) قەبارەی لە هەموویان بچووکترە.

# نیازی وانەکانی قوتابخانە

شاگوڵ عوسمان

ڕۆژانێک بوو لە قوتابخانە وانەمان دەخوێند.. خشتەی وانەکانمان هەڵدەواسراو دەمانووسییەوە، دەڕۆیشتینە ناو پۆلو خۆمان ئامادە دەکرد بۆ ژووانی نێو زانیارییەکان، دەزانم کەمو کورِی هەبوو، بەڵام زۆربەمان خۆزگە بەو ڕۆژانە دەخوازین، دەڕۆیشتینە نێو پۆل، پۆل بە پۆل جانتامان قورستر دەبوو. جارجار پێنووسەکەمان لێ جێدەماو کتێبەکانمان لە ژێر ڕەحلەکەدا بەجێ دەما بۆ یەکێکی تر، بە زەنگ لێدانو هاواری هاوپۆلەکان، هەر لە پەنجەرەکانەوە دەمانڕوانی، دەڕۆیشتینو دەهاتین، بە نێو ئەو وشانەدا گوزەرمان دەکرد کە شەوەکانی بەلاستیک سپی دەکردەوە، بە قەڵەم دایەنێ خەونەکانمان تیژدەکردەوە!

جانتاکەی شانم پێنوسێکی ڕەصاصی تێدابوو، لەگەڵ ڕاستەیەکی شکاو.. کە هەندێک لە هێڵەکانی کاڵ ببووەوە... نەبوو پێنوسە ڕەنگاو ڕەنگەکان، وام بە خەیاڵدا دەهات کە ناتوانین هەموویان پێکەوە کارییان پێ بکەین، هەر ڕۆژەی بۆ سەردانی ڕەنگێک تەرخان کردبوو، نەبوو پەڕەیەکی سپی لە نێو دێڕەکانی تردا، وانەکانی تری خۆم دەنووسییەوە، لە شێوەی ئەوانی تردا خۆم دەبینییەوە، هەرچەندە سێبەرەکەم بچووک بوو، خۆم هەڵدەبڕی تابگەمەوە پێیان، تا ماوەیەک بەنووکی پێییەکانم دەڕۆیشتم، گوێم نەدەدایە ئازارەکانی پێم، چونکە لەزەتێکی گەورەبوونم تێدا دەبینیەوە.

خۆم لە جلی مامۆستاکەمدا، لە تەباشیرە ملەوەنەکانی ئەواندا دەبینیەوە، کاتێک لەوانەیەک دەستم هەڵدەبڕی وامدەزانی دەنگێکە پڕ لە سەدای ئازادی بۆ من، وەک وتاربێژێک وانەکەم دەوتەوە، دەستە دەستە وتارەکەم درێژە پێدەدا، دەتگوت ڕابەرێکی پڕ لە سەروەریم، پۆل دەبوو بە هۆڵێک بە تەنها گوێم لە دەنگێگ بوو، ئەویش خۆم بووم، کە دەمبینی مامۆستاکەم سەری بۆ وانەکانم دەلەقاند.. ئەوسا دەمزانی پەیکەرێکی سەرکەوتنم تۆمارکردووە، لەگەڵ چەپڵەی هاوپۆلەکانمدا، لە دیتنی چاوی هەمووان ڕۆحم پەپوولە ئاسا تەنها گوڵی دەکردە جێی متمانەی پشوی خۆی.

لە نێو دارشتنەوەی وانەکانی خۆمدا (س، ص)م لە کەوانەیەکی کراوەی بیرکاریدا، لە تەواوکارو شیکاری دەستەواژەکاندا، کاتێک سێگۆشەکانم دەخوێند، ئەندازەیەک لە خۆشەویستی بۆ گۆشە تیژەکەی لە لوتکەکەیدا، پاشان فراوانبوونی ئەو دوو ڕاستەهێڵە، تا دەگەیشتە تەریببوون، هێواش هێواش دەمکردە سەوڵێک لە نێو بەلەمی خواستەکانی شەپۆلی دەریادا، بۆی دەڕۆیشتم، دەڕۆیشتم، تا هێڵە چەماوەکان، بیرم دەکردەوە، تا دەگەیشتمە یەکتربڕینی هێڵەکانی خەونەکانم، لە نێو گۆشەیەکی وەستاودا، خۆم دەگیرسانەوە، لەسەردەفتەری خطوط بەیانیدا خاڵ بە خاڵ سەردەکەوتم، لە نێو دووڕاستەهێڵی ئاسۆیو ستونیدا، بیرەکانم دەردەکرد، دەمکردە کردار، کارەکانم کۆدەکردەوە، دیاریکردنی کەرتێکی تەواو، بەشێکم وەردەگرت وەک سێوێک دەمخواردو سێ بەشەکەی ترم دابەش دەکرد، لەوانەیەکی پڕ لە ئەزمونی ئابوریدا، لەگەڵ هەڵئاوسانی بەشێک لە ژیان توانای یەکسانیم هەبوو، وەکو ئەوانی تر، بۆ هەموو خەونێک لێکدانەوەیەکی ترم دەدا.

لە نێو ڕێی زمانی (کوردیو عەرەبیو ئینگلیزی)دا، لە ڕێی زمانێکم بگرن کە پڕ بێت لە ئاسودەییو خۆشەویستی، لە ڕێی زمانی خۆمەوە فێرم بکەن، تۆ زانای لە ڕێی زمانی خۆتەوە بە ئارام بە، نەزانێک فێردەکەیت، تەنها ئەوەندەمزانی تۆ هەمووشتێک دەزانیت، پەلەم لێمەکە، دەزانم هەڵەم تێدا بەدی دەکەیت، لە ڕێی زمانی خۆمەوە، هەڵەکانم لێوەرگرە، حەزم لە دانیشتنی سەر ڕەحلەکەبوو، حەزم لە نووسینی تەختە ڕەشەکەبوو، چونکە تەباشیرەکەی دەستی سپی بوو، لە ئاسمانێکی سامالی پڕ لە ئەستێرە دەچوو، لە نێو زەمەنەکانی ڕابردوو داهاتوودا، بە نێو ئەو کارانەی تێپەڕیوە، بە دیار فەتحەو کەسرەکانەوە، کە لە فەتحی زەمەنێکدا دەبێت هەندێ لە ڕێگاکان کەسر بکرێت تا دەگەیشتمە سکونێک کە پڕبێت لە مانای پشوو، دەڕۆیشتم، تا دەگەیشتمە (I can) بەڵێ من دەتوانم بژیم، خاوەنی دڵێکی شادبم، دەبێت چ مێژوویەکم هەبێت، پاڵەوان، یا قارەمان، شۆڕشی ئێستای من خوێندنی پەڕەیەک، تەمەنی ساڵێک زیاترم دەداتێ، چونکە لە ژیانی ئەوانی تر بۆخۆم گێڕایەوە سەرتەمەنی خۆم، باس دەگەیشتە سەرسنوورەکان، بیرم دەڕۆیشت بۆ سنوری خۆمو ئەوانی تر، سنوری خۆمو ژیان، چ شوێنێک بۆتە پایتەختی دڵی من، بە چ عاشقێکەوە ئەو پایتەختە دروستبووە، سنوری بۆ هێشتوومەتەوە؟! یان پڕە لە جوگرافیای جیاجیا، کە باس لە دۆڵەکان دەکات، چیاکانم بیردەهێنێتەوە، کە دەگەیشتینە دەشتەکان، بیرم لە باڵای دارەکان دەکردەوە، لە پێگەی دەشتە سەوزەکان.

لە پەندۆلێکدا، لە خێرایی دووری نێوان خۆمو کاتەکان نەدەگەیشتم، تا نیوتن هات لە سێوێکدا بە ژیانمدا هاتەوە، ئاخۆ توانای دروستکردنی هاوێنەیەکی دروستم هەیە. لە جوڵەو زەبری دەنگەکاندا. لە نێو خولخولەکانی نێو تەزووی ڕۆژگارەکانمدا، هەمیشە لە پرسیارێکدا بووم؟ خۆ بوونەوەرانی تریش خاوەنی مۆخی کاسەی

سەرن، ئەی میکانیزمی عەقڵو زمانی من چ خاوەنێکی هەیە؟ کەوا مامەڵەیەکی تر دەکات، لە نێو ئەزموونی جەستەییەکانداو زمانی زیندەوەرزانیدا، خاوەنێکی بێ سنور هەبوو، لە لایەك خۆمی پێدەناساندەو لە لایەك هەموو لێکچووەکان، لە تینوێتی کەمۆڵەیەك ئاوی ($H_2O$)دا کارلێکم دەکردو ئاوێتە دەبووم، لە زرنگی شووشەکە بە ئاگا دەهاتمەوە، گەردیلە گەردیلە، بازنەیەك لە ئەلکترۆنم دروست دەکردو پەیتا پەیتا دەرژامە نێو بازنەی گەردون، هێندە دەچوومەوە یەك، هاوشێوەی مانگ دەنوشتامەوە.

لە (undo)و (redo)ی یەك بە یەکی یادگارییەکانمدا.. هەندێکیانم (copy) دەکرد.. هەندێکی تریشیان (past).. دەبێت هەندێکی تریان (delete)بکەم، بە کەڵکی هیچ زەمەنێك نایەت، ئێستا (folder)ێکی تازەم کردووەتەوە، هەر (page)ێك (insert)ی بابەتێکی تازەم پێداوە.. (View)ی نێو خواستەکانی خۆمم کردووە. دەتوانم بە (enter)ێك هەمووی بە ڕووی خۆشحاڵی خۆمدا بهێنمەوە، مافم پێبدە باس بکەم، جیاوازی نێوان منو هاوپۆلەکەم قبوڵبێت جا لە هەر وێنەیەکدا بێت، وێنەکان ژیانم زیاتر لا ڕازاوە دەکات، لە تۆپێکدا هاتە دەستم لە نێو گۆڕەپانی ژیاندا، ئەمە فرسەتێکە دەبێت گوڵێکی تێدا بکەمە باوەش، لە دەستی نەدەم، هەمووی دەکەم بە سرودێکی پڕ لە (باوەشی تۆ ئەی نیشتمان) هەموو وانەکان بۆ دەستورێکی پڕ لە سەروەرییە بۆ تۆ ئەی نیشتمان، چونکە دەبێت هەموو هەست بە لێپرسراوی بکەین لە وانەکانی ئایندا، کە گشت وانەکانی تر قەرزاری تۆن، ڕێی تۆیە کە دەبێت وانەکانی تر بخوێنین، سوپاست دەکەم خودایە، کە ئێستا دەتوانم سنورەکانی خۆم بکێشم، کە دەتوانم مێژوویەك بم گەر هێندەی دڵۆپە ئاوێکیش بێت بڕژێتە دەریاوە، دەتوانم چەند بازنەیەکی سەربەخۆ دروست بکەم، سوپاست دەکەم کە ئاوێتەت کردم لە نێو دەفرەکانی بەختەوەری گەر بەبزەیەکیش بێت، یارمەتیمان بدە، گەر یارمەتی تۆ نەبێت ناتوانین ڕێگەکە تەواوبکەین، خودایە ئەمە ویستی تۆ بوو، خۆشحاڵین، بەردەوامیمان پێ ببەخشە، گوێ نادەینێ جانتاکەمان قورستربێت، پێنووسەکەمان هەر ڕەنگێك بێت، سوپاست دەکەم، چونکە ڕۆژێك دێت بە جوانترین ڕەنگ دەستمان بکەوێتەوە، دڵنیام هەموو لە نێو تاقیکردنەوەداین، هیوادارم هەموو خاوەنی نمرەیەکی نایاب بین، دڵنیام هەر یەکەمان پسپۆرییەکمان هەیە، ئەوسا سنوری نیازەکان زۆر لەوە گەورەترن، دڵنیام گەر لە شوێنێك مامۆستابین، لە شوێنێکی تر فێرخوازین، تا قەڵەمو وانە بۆ ئەبەدی هەربمێنێت.

شەهێن حەمە عەلی



# تکایە وەك بەڕێز (ئاسایی) مەبە

بەڕێز (ئاسایی) لە ساڵی (١٩٠١) لە دایکبووەو نمرەکانی خوێندنی خوار مامناوەندی بووە، لە ساڵی (١٩٢٤) هاوسەرگیری لەگەڵ کچێکدا کردووە بە ناوی (مامناوەندی)، ئەم خێزانە منداڵێکیان بوو ناویان نا (کوڕی ئاسایی)، پاشان کچێکیان بوو ناویان نا (کچی ئاسایی)، چل ساڵی تەواوی بە کاری بێ سوودەوە بەسەر برد، لە هیچ هەلێکدا، یاخود تاقیکردنەوەیەکدا نەیدەویست توانای خۆی بەرەو پێشەوە ببات، لە هیچ شتێکدا هاوکاری هیچ کەسێکی نەدەکرد، دروشمەکەی بریتی بوو لە: (ئەوە پەیوەندی بە منەوە نییە! لە شەڕ دوور بکەوەو گۆرانی بڵێ، دەست بە کڵاوەکەتەوە بگرە، با با نەیبات!!).

شەست ساڵ ژیا، بێ ئامانجو بێ نەخشەو بێ ویستو بێ متمانەو بێ هیواو بێ هیچ لێبڕانێك!

لە پاش مردنی لەسەر گۆڕەکەی نووسیبوویان: ئەمە گۆڕی بەڕێز ئاساییە لە ساڵ (١٩٠١) لە دایکبووە، ساڵی (١٩٢٤) کۆچی دوایی کردووەو لە ساڵی (١٩٦١) نێژراوە، هەوڵی نەداوە هیچ شتێك لە ژیاندا ئەنجام بدات، زۆر کەمی لە ژیان ویستووە، ژیان باجەکەی دا!

بەڕێزان، وەرن با لەم چیرۆکەی سەرەوە گۆڕان لە خۆماندا دروست بکەین، چونکە مرۆڤ دروستکراوێکی تایبەتییە لە نێوان هەموو بوونەوەراندا کە خوای گەورە لەم جیهانە فراوانەدا دروستی کردوون، ڕێزو تواناو ژیری مرۆڤی داوە بەسەر هەموو بوونەوەرانی تردا، لەبەرئەوە پێویستە مرۆڤ بەهای خۆی بزانێتو پەیوەندییەکی قووڵی هەبێت بە دەوروبەرییەوەو لە خۆشیو ناخۆشییەکانی کەسانی تردا بەشدار بێت، تەنها هەوڵ بۆ خۆی نەداتو بەس!

ئەرکێکی ڕەوشتیو ئاینیو مرۆییە کە هەموو تاکێك هەست بە لێپرسراوی بکات بەرامبەر بە کەسانێك کە پێویستیان بە هاوکارییە.

لە دوارۆژیشدا بەرپرسیارە بەرامبەر بە هەموو هەڵسووکەوتێکی، پێویستە ئامانجمان هەبێت بۆ ژیانو نەخشەی بۆ دابنێینو متمانەمان بەو نەخشەو ئامانجە هەبێت، سەرەڕای ئەوەش نابێت تەنها بە هاتنەدی ئامانجەکانی خۆمان وابزانین پشکی شێرمان بەرکەوتووە. بەڵکو بەردەوام هەوڵ بدەین لە پێناوی خۆشبەختیو ئاسوودەیی دەوروبەرماندا، مرۆڤ نابێت تەنها بۆ خۆی بژی، بەڵکو بەشێك لە ژیانمان تەرخان بکەین بۆ بەختەوەری کەسانی دی، تا لەوە زیاتر زیندووی مردوو لە ژیاندا زۆرتر نەبن!

ئێمرە چاڤدار
و: لە تورکییەوە: ئیمان ناصح



# فیداکاری مامۆستایەکی زانکۆ

زۆر منداڵ بووم کە باوکم لە دەست دا، دایکم بۆ من هەم دایکایەتی دەکرد، هەم باوکایەتی، هیچ خوشك و برایەکی دیکەشم نەبوو، دایکیشم هاوسەرگیری پێك نەهێنایەوە، بۆیە پێکەوە ناڕەحەتییەکانی ژیانمان دابەش دەکرد، کە دەڵێم ناڕەحەتی ژیان مەبەستم ئەوەیە کە باری ئابووریمان زۆر خراپ بوو، نەماڵ نە کەلوپەلێکی باشمان نەبوو.

دایکم کاری خاوێنکردنەوەی ماڵانی دەکردو منیش لای هەندێك بازرگان بە پارەیەکی کەم کارم دەکرد..

بەڵام دوای ماوەیەك دایکم نەخۆش کەوتو چیتر نەیتوانی کار بکات، بۆیە هەموو ناڕەحەتییەکی بژێوی پەیداکردن کەوتە سەرشانی من، دەبوایە کاری زۆرم بکردایە.

بە هەزارویەك ناڕەحەتی توانیم زانکۆ وەرمبگرێت، بەڵام ناڕەحەتییەکانی تر لەگەڵ دەستپێکردنی زانکۆدا بوون.

بەناچاری لەگەڵ دایکم ڕۆیشتین بۆ ئەو شارەی کە لێی وەرگیرابووم، لەوێ خانوویەکمان بەکرێ گرتو منیش دەستم کرد بە دەوامکردن..

بەڵام هێندە پێداویستیو خەرجییەکان زۆر بوون، بە جارێك ڕووخاو نەمدەتوانی هەستمەوە.

هەر چۆن بوو هەوڵمدا کارێك لە کافیتریای شەوانەی زانکۆ بگرمە دەست، ئەو پارەیەی کە وەرم دەگرت تەنها بەشی کرێی خانووەکەی دەکرد، ئیدی نەبەشی دەرمانی دایکە نەخۆشەکەمی دەکرد، نە بەشی پێداویستییەکانی خوێندنەکەی خۆشم.

لەو کاتەدا کە ئیتر بیرم لەوە دەکردەوە واز لە خوێندن بهێنمو بگەڕێینەوە بۆ شارەکەی خۆمان، بڕیارمدا بچمە لای مامۆستای ئینگلیزیمان کە مامۆستایەکی زۆر بەڕێزو خۆشەویست بوو، منیش زۆرم خۆش دەویست، تا حاڵی خۆمی بۆ باس بکەم..

مامۆستاکەم لە ناخەوە گوێی لێ دەگرتم، تەنانەت چاوەکانی پڕ بووبوون لە فرمێسك!

پاشان وتی: چیرۆکی ژیانی تۆ هاوشێوەی ژیانی من بووە، جیاواز لەوە کۆمەڵێ ئامۆژگاری کردمو پێی وتم: ئاگادار بە هیچ کات نەڵێی واز لە خوێندن دەهێنم، من یارمەتیت دەدەم، لە شوێنێك کارێك، یان بڕێك قەرزت بۆ وەردەگرم، کۆمەڵێ هاوڕێی دکتۆریشم هەیە، دایکت دەبەینە لایان بۆ چارەسەر، سەرەتا هەندێك کتێبت دەدەمێ ئەمانە بخوێنەرەوەو لایەنی دەروونیت ئارام بکەرەوە، پاشان وردە وردە یەك دەبینینو پێکەوە کێشەکان چارەسەر دەکەین.

بەوەی کە مامۆستاکەم گوێی بۆ گرتمو بەڵێنی یارمەتیدانی پێدام، زۆر دڵخۆش بووم ئەمە هیوایەکی گەورەی پێبەخشیم، وەك ئەوەی هەموو شتێك تەواو بووبێتو دووبارە 'سڵاو' لە ژیانو خوێندن بکەمەوە.

بە خوێندنەوەی ئەو کتێبانەی کە مامۆستاکەم پێی دابووم لایەنی دەروونیم زۆر ئارام بووەوە، تێڕوانینم بۆ ژیان گۆڕاو دووبارە بە گەشبینییەوە لە ژیانم

و: ئەمیر ئەحمەد عەبدولقادر

دەروانی، بە تایبەتی لە پەرستشدا کە ناخی پڕ کردبووم لە هۆگریو خۆشی!

پاش ماوەیەك مامۆستاکەم کارێکی زۆر باشی بۆ دۆزیمەوەو دایکیشم دەبرد بۆ چارەسەر، هەروەك منداڵی خۆی سەرپەرشتی دەکردم، منو دایکیشم هەمیشە سوپاسی هەڵوێستە جوامێرەکانیمان دەکردو نزای خێرمان بۆ دەکرد!

بەم شێوەیە من گەیشتمە کۆتا ساڵی خوێندنو مامۆستاکەشم بۆ خوێندنی ئەکادیمی بەرەو ئینگلتەرا سەفەری کرد، پاش ڕۆیشتنی مامۆستاکەم ئینجا من ڕاستەقینەی تەواوم زانی!

ئەوەی کە من لە کارەکەمدا پارەیەکی زۆر باشم وەردەگرت، بەڵام هەمووو مانگێك نیوەی ئەو پارەیەی کە وەرم دەگرت لە گیرفانی مامۆستاکەمەوە دەدرا بە سەرۆکی کارەکەمو وەرم دەگرت!

مامۆستاکەم بە هاوڕێ دکتۆرەکانی وتبوو: کە بەبێ بەرامبەر چارەسەری دایکم بکەن، بەڵام تەواوی نرخەکان خۆی دابووی!

واتە سێ ساڵی تەواو ئێمە لە ژێر چاودێریو توانای ئەودا ژیاوین!

کاتێك هەمووو ئەمانەم زانی بە واتای وشە توشی "شۆك"بووم!

چۆن مرۆڤێك تا ئەم ڕادەیە باش دەبێت؟ بەو ڕادەیە خۆبەخش دەبێت؟ یانی ئەوەندە چاکەخواز بێت؟

بەم کۆتا وانەی کە لە مامۆستاکەمەوە فێر بووم زیاتر بیرکردنەوەو تێڕوانینەکانم بۆ ژیانو کەسانی چواردەورم گۆڕا، واتە ژیان پێویستی بە نیگەرانی نییە، پێویستیشی بە یاخی بوون نییە!

هەموو مرۆڤێك پێویستە لە بەردەم کێشەکانی ژیانیدا پێداگر بێت، خوای میهرەبان لەو کاتەدا دەرگایەکی ڕزگار بوونی بۆ دەکاتەوە!

خوای گەورە لە مامۆستاکەی منو تەواوی ئەو مامۆستایانەی کە وەك ئەوون ڕازی بێتو نموونەیان زیاد بێت تا بێچارەکانی وەك ئێمە لە ژیاندا ڕزگار بکەن!



# ئەو (١٠) تایبەتمەندییەی داهێنەران لە خەڵکانی تر جیادەکەنەوە !

لێکۆڵینەوەیەکی کۆمەڵایەتی لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەریخستووە کە کەسە داهێنەرەکان (١٠) تایبەتمەندییان هەیە کە لە خەڵکی تر جیایان دەکاتەوە، (بۆب وبنستین) نووسەری پەرتوکی (دە ڕێگا بۆ ئەوەی ببیتە داهێنەر لە کارەکەتدا) دەڵێت: هەندێك کەس هەر لە تەمەنی منداڵییەوە توانای داهێنانیان هەیە، دەتوانن ئەو تایبەتمەندیەیان بە دەستبهێنن بە هۆی ڕاهێنان، (بۆب وبنستین) ئامۆژگاری خوێنەران دەکات کە ئەم دە ئامۆژگارییە پەیرەو بکەن بۆ ئەوەی ببنە داهێنەر لە ژیانی ڕۆژانەیاندا:

١- ڕەسەنایەتی: لە ڕەوشتو تایبەتمەندییە دەگمەنو نائاساییەکان لە کاتو ئەو کەسانەی هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا دەکەیت بگەڕێ.

٢- بەرهەمداری: بە دوای خێراترینو باشترین ڕێگادا بگەڕێ بۆ هەڵسانت بە هەر کارێك، هەوڵبدە بیروهۆشت کۆبکەیتەوە لەو کارەی کە پێوەی سەرقاڵی، ئەوسا تواناو خوێندنەوەی تازەت بۆ ڕوون دەبێتەوە کەپێشتر بە خەیاڵتدا نەهاتووە.

٣- خۆگونجاندن: کەسە داهێنەرەکان هەمیشە هەوڵی گۆڕانکاری دەدەن، لەبەرئەوە بە هیچ شێوەیەك خۆت بە هەمان شێوازە کۆنەکەوە خەریك مەکە لە کارەکانتدا، وابڕوانە گۆڕان کە کارێکی کاریگەرە.

٤- نەرمی نواندن: هەمیشە ئامادەی گۆڕانکاری بەو لەگەڵ هەڵکردنی تەوژمەکان بڕۆ، کاتێك چوویتە ناو ئەو کارگەیەی کە کاری تێدادەکەیت کە ئامێری کۆمپیوتەری تێدایە هەوڵبدە خۆت فێرببی کە چۆن کار دەکات، هەرگیز مەڵێ ئەمە شتێکی ئاڵۆزەو ناتوانرێت سوودی لێوەربگیرێت.

٥- لێکۆڵینەوەی لۆژیکی: هەوڵبدە بە دوای ڕاستییەکاندا بگەڕێی، چاو بە دوای شتە شاراوەکاندا بگێڕە، بۆ نموونە کاتێك دەتەوێت ئۆتۆمۆبیلێکی نوێ بکڕیت ڕازی مەبە بە هەر شتێك کە فرۆشیارەکە پێتی دەڵێت، پێویستە لەسەرت بەدوای ڕاستییەکاندا بگەڕێیت لەسەرچاوەی تر.

٦- بیرکردنەوە لە داهاتوو: فێرببە کە چۆن دەبیتە چاودێرو شیکەرەوە، چەندەی لە تواناتدا هەیە زانیاری کۆبکەرەوەو شیان بکەرەوە، دواتر بە دادگەری بڕیاریان لەسەر بدە، فێربە بۆ خۆت بیر بکەیتەوە.

٧- هەستیاری: لە جیهانی چوار دەورت ڕامێنیو گوڵێك بچنەو لێیڕامێنەو وردبەرەوە لە ڕەنگەکانیو بۆنی بکە، هەستیاری تۆ بۆ جیهانی ناوەوەو دەرەوەی چواردەورت کاریگەرە بۆ داهێنانەکانت.

٨- خۆشەویستی تێگەیشتن: وەك خۆیان لە شتەکان ڕازی مەبەو پرسیار لە خەڵك بکە کە شتەکانت بۆ شیبکەنەوە کە تێیان ناگەیت.

٩- نوێگەری: پێویستە ئازایەتیت هەبێت بۆ تاقیکردنەوەی شتی نوێ، ئەگەر ئارەزووت هەبوو خانوییەك لە ژێرزەوی دروست بکەیت، بیرۆکەکەت ئەنجام بدە.

١٠- ئازایەتی: بوێری پێویستە بۆ داهێنان، زۆربەی داهێنەران ڕەخنەیان ئاراستەی بیروڕانوێیەکەیان کراوە، لەگەڵ ئەوەشدا بەردەوامبوون لەسەر جێبەجێکردنی کارەکانیان.

بەشی سێیەمو کۆتایی

9: لە ئینگلیزییەوە: پشتیوان موبارەك كەریم

# ٩٨ کلیل بۆ سەرکەوتن

٦٦- کاری ئەمڕۆ مەخەرە سبەی.

٦٧- برێـك لەو داهاتەی کە دەسـتت دەکەوێت ببەخشە بە کارێکی خێرخوازی کە خۆت باوەڕت پێیەتی.

٦٨- بە هۆشیارییەوە بژیو بڕیار بدە دڵخۆش بیت.

٦٩- ئـەو حەزوئارەزوانـەی کـە لـە ناختدایە هەوڵ بدە پێش مردن بیانهێنیتە دی، بە ڕادەیەك با لە کاتی چوونە تەمەنو سەرەمەرگدا زۆربەی ئاواتو ئارەزووەکانت هاتبنە دی.

٧٠- بە باشـی منداڵەکانت ئامۆژگاری بکە، چونکە لە سەر خەڵك پێویست نییە چارەسـەری ڕەفتاری هەڵەی منداڵەکانت بکەن.

٧١- کاتـی زیاتـر لەگـەڵ منداڵەکانت بەسـەر بـەرە، هەتاکو بەرەبـەرە گەورەتر دەبن.

٧٢- بـا هیچ نهێنییەکت نەبێت کە لە هاوسەری ژیانتی بشاریتەوە.

٧٣- لە بیرت بێت هەموو کەس هەڵە دەکاتو هەمیشە خۆت ببەخشەو دڵتەنگ مەبە بەرامبەر بەو کارە نادروستانەی کە لە پەنهانیدا کردوتن.

٧٤- لـە پرۆتۆکۆڵی هەموو ژینگەیەك تێبگە کە دەچیتە ناویەوە.

٧٥- بزانـە کە هاوڕێکانت پێشـبینی دواڕۆژتن، بزانە هاوڕێیەتی کێ دەکەیت.

٧٦- گەشت بکەو جیهان ببینە.

٧٧- ڕۆژانـە بیر بکـەرەوە بە خەیاڵ وێنای سەرکەوتن بکە.

٧٨- هەرگیز لە فێربوون مەوەستە.

٧٩- ئەو ڕاسـتییە بزانە کە بیرۆکەو بیرکردنەوەکانت دەبنە واقیعی ژیانی تۆ.

٧٨- هەمیشە دڵسۆزو بەوەفا بمێنەرەوە بۆ هاوسەرەکەتو بەڵێنی خۆت ببەرە سەر بەرامبەری.

٧٩- هـەوڵ بدە گۆڕانێك پێش مەرگی خۆت دروسـت بکەیت کـە جیهانو ژیانی خەڵکی بەرەو باشتر ببات.

٨٠- لەگەڵ هەموو کەسێکدا بە ئاشتیو ئارامییەوە بژی.

٨١- خۆتت خۆش بووێت.

٨٢- هەرگیز خۆت مەخەرە کاروبارێکەوە کە زۆر توندوگەرموگوڕ بێت.

٨٣- دراوسـێکەت وەك خـۆت خـۆش بووێت.

٨٤- بەشـێوەیەك بـژی کـە بـاوكو دایکتو نەوەکانت شانازیت پێوە بکەن.

٨٥- ئازاو بە جەرگ بە، بە شێوەیەکی ڕەسـەنو ئازاد لـە دایك بوویت، لاسـای کەس مەکەرەوەو لە سەرشـێوەی کەسێکی تر مەمرە.

٨٦- لـە هەمـوو کاروبارێکـدا کـە ئەنجامی دەدەیت هەوڵ بدە کە تەواوی بکەیتو بە باشـترین شێوە سەرکەوتن بە دەست بهێنیت.

٨٧- ماڵو نووسـینگەو ئۆتۆمبێلەکەت پاكوخاوێن ڕاگرە.

٨٨- بودجەیەك دابنێو پێوەی پابەند بە.

٨٩- بـا ئامانجـی ڕۆژانـە، هەفتانەو مانگانــەت هەبێتو بەردەوامبە لە سـەر جێبەجێکردنیان.

٩٠- بزانـە لە کوێوە هاتوویتو بۆچی هاتوویتو بۆ کوێ دەچیت.

٩١- بـە پێی توانا کێشـەکانی خەڵکی تریش چارەسەر بکە.

٩٢- بزانـە کە ئەو کەسـایەتییەی کە تۆ ئێستا دەیبینیت، هەر ئەو کەسایەتیەی پاشەڕۆژی تۆیە.

٩٣- باوەڕت بـە توانای خۆت هەبێت بۆ سەرکەوتن.

٩٤- هـەر ئەمـڕۆ دەسـت بکـە بـە جێبەجێکردنی ئەم چالاکیانە.

٩٥- ئـەو ڕاسـتییە بزانە کە تۆ خۆت جیهانی خۆت دروست دەکەیت.

٩٦- بزانـە کـە تـۆ لـە جیهانێکـی دۆسـتانەدا دەژیـت نـەك لـە جیهانێکی نەیارو دوژمنکارانەدا.

٩٧- ڕۆژەکانـی ژیانت بە کاتی خۆشو دوور لە خەمو پەژارە بەسەر بەرە.

٩٨- هەموو خاڵەکانی ئەم لیسـتە بە تەواوی بخوێنەرەوە.

# بۆ ئاسوودەیی دڵەکان ڕێگەکان گوڵڕێژ بکە



ئا: بێگەر فارس

دەگێڕنەوە پیاوێك لە شارێكی گەورەدا دەژیا، هەموو ڕۆژێك بۆ ئەوەی بچێتە سەر كارەكەی بە پاس دەڕۆیشت، تا دەگەیشتە كارگەیەكی گەورە، ئەو ڕێگەیەش كە دەیبڕی پەنجا خولەكی دەخایاند.

هەموو ڕۆژێك لە یەكێك لە وێستگەكاندا خانمێكی بە تەمەن سەردەكەوت، هەمیشە هەوڵی دەدا لە تەنیشت پەنجەرەوە دابنیشێت.

خانمەكە لە ڕێگەدا جانتاكەی دەكردەوەو كیسێكی دەردەهێناو هەرچی تێدا بوو چنگی پێدا دەكردو لە پەنجەرەكەوە فڕێی دەدایە دەرەوە، ئەم كردارە هەموو ڕۆژێك دووبارە دەبووەوە.

یەكێك لە سەرنشینەكان لە خانمەكەی پرسی: چی فڕێ دەدەیتە دەرەوە؟!

خانمەكەش وتی: تۆو فڕێ دەدەم.

پیاوەكەش وتی: تۆو، تۆوی چی؟!

خانمەكە وتی: تۆوی گوڵ، لەبەرئەوەی كە سەیری دەرەوە دەكەم ڕێگاكەی هیچی تێدا دەرناكەوێت، پێم خۆشە كە گەشت دەكەم ڕێگەكە پڕگوڵی جوانو ڕەنگاوڕەنگ بێت تا دیمەنێكی ڕازاوە ببەخشێنێت.

كاتێك بە شوێنێكدا كە پڕ گوڵو گوڵزار بێت، ئایا ئەو دیمەنە چەندە جوان دەبێت؟

پیاوەكە وتی: بەڵام تۆوەكان دەكەونە سەر جادەكەو ئوتومبێلەكانیش بەسەریدا دەچنو دەیانشێلن، تۆ پێت وایە ئەو گوڵانە بتوانن لەسەر لێواری ڕێگەكە گەشە بكەن؟

خانمەكە وتی: وا گومان دەبەم كە زۆربەی تۆوەكان بە هەدەر دەچن، بەڵام هەندێكی دەكەوێتە سەر خۆڵەكەو ئەو كاتانەی ڕووەك گەشە دەكات گوڵەكانیش پێدەگەنو گەشە دەكەن.

پیاوەكە وتی: بەڵام ئەو تۆوانە پێویستیان بە ئاو نییە تا گەشە بكەن؟!

خانمەكە وتی: بەڵێ، ئەوەی لەسەر منە كەمتەرخەمی ناكەم چەند ڕۆژێكی تر باران دەبارێتو تۆوەكانیش دەبنە ڕووەكێكی پێگەیشتوو، خۆ، ئەگەر من ئەم تۆوانە هەڵنەدەم ئەوا ڕووەكێك لەوێدا بوونی نابێت، سەری بەردەو لای پەنجەرەكە سوڕاندو دەستی بە كارەكەی كردەوە.

پیاوەكە لە پاسەكەدا دابەزیو بیری لە خانمەكە دەكردەوە هەستی دەكرد خەڵەفا بێت!

ڕۆژان تێپەڕی.. پیاوەكە بە هەمان ڕێگەدا گەشتی دەكرد، لە تەنیشت پەنجەرەوە دانیشتبوو، سەری بەرزكردەوەو بۆ دەرەوەی دەڕوانی، سەرسام بوو بە بینینی لێواری ڕێگەكە، زۆرجوانو ڕازاوە بوو بە گوڵ داپۆشرابوو! لە دڵی خۆیدا وتی: ئاه.... چەندە زۆرن! چەندە جوانن!

ڕازاوەیی ڕێگەكە سەرنجی سەرنشینەكانی ڕادەكێشا... لەو كاتەدا پیاوەكە خانمەكەی هاتەوە یاد كە تۆوەكانی دەوەشاند، هەربۆیە لە بلیت فرۆشەكەی پرسی: ئەو خانمەی كە هەمیشە تۆوی دەوەشاند لە كوێیە؟

لە وەڵامدا وتی: مانگێك لەمەوپێش بە هۆی جەڵتەی دڵەوە گیانی سپارد!

پیاوەكە بۆ شوێنەكەی خۆی گەڕایەوەو هەر سەیری دەرەوەی دەكردو بەو دیمەنە جوانە سەرسام ببوو، بیری دەكردەوەو لەبەرخۆیەوە دەیگوت: گوڵەكان پشكوتونو ڕێگەیان تەنیوە، بەڵام ئەو خانمە لەو كارەی چ سودێكی بینی كە نەگەیشتە ئەوەی هەست بە جوانی ئەو ڕێگەیە بكاتو ئەنجامی كارەكەی ببینێت؟!

لەو كاتەدا گوێی لە پێكەنینی منداڵێك بوو لەسەر كوشنەكەی بەردەمیدا دانیشتبوو بە تامەزرۆیەكی زۆرەوە لە پەنجەرەكەوە ئاماژەی بۆ دەرەوە دەكردو هاواری دەكرد: بابەگیان... بابە سەیری دەرەوە بكە!

ئەو ڕێگەیە چەندە جوانە! ئەی خوایەگیان ئەو ڕێگەیە هەمووی پڕە لە گوڵی جوان!

لەو ساتەدا پیاوەكە تێگەیشت ئەو خانمە بۆچی ئەو كارەی دەكرد؟!

هەرچەندە ئەو نەیتوانی بگاتە ئەو كاتەی خۆشی لەو دیمەنە ڕازاوەیە بكات، بەڵام بێگومان زۆر بەختەوەرە، چونكە دیارییەكی مەزنی بە خەڵكی بەخشی..

بەڕاستی پەیامێكی زۆر مەزنە!

تۆش هەستە بە چاندنی هەر تۆوێك كە دەبێتە مایەی بەختەوەری بۆ كۆمەڵگەكەت، مەرج نییە خۆت لە بەرهەمەكەی بخۆیت، یان لە ژێر سێبەرەكەیدا بحەوێیتەوە، بەڵام بێگومان نەوەكانت، یان هاونیشتمانەكانت شانازی بە بەرهەمەكانتەوە دەكەنو ستایشی كارە جوانەكانت دەكەن!

زاهیر زانا

# نوێبوونەوەو گۆڕانكاری

ئەگەر سەرنجی ئەم گەردونە مەزنە بدەین بەو هەموو دروستكراوو بەدیهێنراوە ڕەنگاو ڕەنگو هەمەجۆرو هەمەچەشنەوە، دەبینین هەموو شتێك جۆرێك گۆڕانكاریو نوێبوونەوەی تێدایە، هەر لە شەوو ڕۆژو ئەستێرەو هەسارەو وەرزەكانو درەختو باڵندەو تەواوی زیندەوەرو بەدیهێنراوەكانی تریش. كاتێك هەموو بوونەوەر ملكەچو مەحكوم بێ بە نوێبوونەوەو گۆڕانكاری، ئەی دەبێ ئەو دروستكراوەی كە ئاسمانەكانو زەوی خراوەتە ژێردەستیو هەموو گەردونی بۆ ڕامكراوەو پلەی سەرداری دروستكراوەكانی پێدراوە، چەندە پێویستی بەوە هەبێت كە لە گۆڕانو نوێبوونەوەدا بێت؟ بەرەو تێگەیشتنی باشتر لە خۆیو ئەركو فرمانو بەهرەكانی. بەرەو تێپەڕاندنی ڕێگرو ئاستەنگو كۆسپەكانی، بەرەو برەووبردنەوە...

ئێمەی مرۆڤ دیسان وەك هەموو شتەكانی تر خاوەنی تەمەنێكی دیاریكراوینو لە گەشتێكداینو هەر قۆناغەی تەمەنمان بەشێكی ئەم گەشتەیە، بۆیە دەبێت بەردەوام لە خۆمان بپرسین ئێمە ئێستا لە كوێین؟ وەڵامی ئەم پرسیارە زۆر گرنگو پڕ بایەخە تا بزانین دەمانەوێت لە كوێوە بەرەو كوێ بچینو پێویستمان بە چ گۆڕانكاریو نووێبوونەوەیەكە. ئەمەش لە پێناوی ئەوەی تەركیز بكەینە سەر ڕێڕەوی ژیانمانو بزانین ڕوو لە كوێیەو بەرەو كوێ مل دەنێت، چونكە دواجار بەرهەمی ڕێڕەوی ژیانمانە كە پێمان دەڵێت: ئێمە چینو چی بووینو بۆچی دەبین، ئەم ئەنجامەش پێویستی دەكات لەسەرمان ببینە چاودێر بەسەر ئاڕاستەی ژیانمانەوە، تاخۆمان بپارێزین لەسوڕی متبوونو ناوچەی تەممەڵیو بێكاریو نەبینراو كە تەمەن تێ بپەڕێتو هێشتا ئێمە هەر ئەوەمان هەبێت كە چەندین ساڵ لە مەوبەر بە دەستمان هێناوە، لەو زەمەنەی تێپەڕیوە ژیانی ئێمە نووێبونەوەیەكی بە خۆیەوە نەبینیبێت! دەسهاتی مادیو مەعنەویمان نەگۆڕابێت! ئەمەش وەكو ئەوە وایە پێش چەندین ساڵ لەمەوبەر مردبێتینو تەنها هەناسەمان كێشابێو خۆراكمان خواردبێت، ئەگینا ئەوە ژیانێكی شایستە بە گەورەیی مرۆڤو پلەوپایەی مرۆڤبوونی نییە كە خاوەنی بیركردنەوەیەو كانێكی پڕ بەهرەیەو دەریایەكی پڕ مرواریو گەوهەرە.

نووێبونەوەو گۆڕانكاری پێویستییەكی ژیانمانەو گەرەنتی بەردەوامبوونو دانەبڕانە لەگەڵ ڕەوڕەوەی پێشكەوتنو بەرەوپێشچوون. هەر لەم ڕێگەیەشەوەیە دەتوانین بەردەوام گەشەبكەینو زیندووو چالاكو بە توانا بمێنینەوە، دەكرێت ژیرانە پەند لە ژیانی (باز) وەربگرین كە بۆ مانەوەی لە ژیاندا چۆن نووێبونەوەو گۆڕانكاری دەكات: (باز درێژترین تەمەنی هەیە لە نێو باڵندەكاندا كە نزیكەی حەفتا ساڵ دەژی، بەڵام بۆئەوەی بگاتە ئەم تەمەنە دەبێت گۆڕانكارییەكی سەختوگران ئەنجام بدات، كاتێك دەگاتە تەمەنی چل ساڵی نینۆكەكانی نەرم دەبن، بە شێوەیەك كە توانای گرتنی نێچیریان نامێنێو دەنووكی زیاد دەچەمێتەوە، بە هۆی زۆری تەمەنییەوە پەڕێكی زۆر دروست دەبێت، كێشی لاشەی زیاد دەكاتو توانای گەڕانی لە شوێنە جۆراوجۆرەكاندا نامێنێت، ئەم بارودۆخە باز وا لێدەكات، یان خۆی بدات بە دەستەوە بۆ مردن، یاخود پرۆسەیەكی گۆڕانكاری جێبەجێ بكات، كە نزیكەی سەدوپەنجا ڕۆژی دەوێتو دەبێت بچێتە سەر لوتكەیەكی بەرزو نینۆكەكانی لێبكاتەوەو دەنووكی بدات بە بەردێكدا بۆئەوەی چەمانەوەی دەنوكی بشكێو چاوەڕێ بكات تادەنوكی دێتەوەو بە هۆی دەنووكە تازەكەیەوە پەڕە كۆنەكانی لێدەكاتەوەو دوای پێنج مانگ بەوپەڕی گوڕوتینەوە دەست پێدەكاتەوەو دەتوانێت سی ساڵی تر بژی).

مرۆڤیش ئەگەر بیەوێت بۆ هەمیشە وەكو باز لە بەرزاییدا بمێنێتەوە، دەبێت بەردەوام خەریكی لابردنی ئەو خووڕەوشتو هەڵسوكەوتو بیرانە بێت كە دەزانێت خراپو نەشیاوە، خۆی نوێ بكاتەوە بە زانیاری تازەو ڕەوشتی شیرینو جوانو پڕبەهاو بیریشی نوێ بكاتەوەو بەردەوامیش چاو بگێڕێت بە ژیانیدا بۆئەوەی كەموكورتیو خاڵە لاوازەكانی كەسێتی بنەبڕو بژار بكاتو ئاگاداری نەریتەكانی بێو بزانێ چی كردووەتە نەریتو لە خۆی بێ ئاگا نەبێت، هەر وەك وتراوە بەچی دەچێت مرۆڤ هەموو دنیا بەرێتەوەو خۆی بدۆڕێنێت.

بابزانین هەرچەندە بە توانابین ئەگەر نوێبوونەوەو گۆڕانكاری نەكەین لە خۆماندا ئەوا دوادەكەوینو ناتوانین بگەینە لوتكە بەرزەكانی سەركەوتنو پێشكەوتن. ئەگەر بەردەوام تەوری ژیانمان تیژ نەكەینەوە توانای ئەوەمان نابێت سەختییەكانی ڕێگەی سەركەوتن ببڕینو باخی ژیانمان بەرهەمەكانی كرچو كاڵ دەبێتو میوەی ئامانجەكانمان ناگەنە وەرزی پێگەیشتنو ناتوانین تامی شیرینییەكەی بچەژین، بۆیە با بڕیار بدەین هەمیشە خۆمان نوێبكەینەوە، بڕیاری گۆڕانكاری ئەرێنی لە خودی خۆماندا بدەین، تابتوانین دنیاو دەوروبەرمان بگۆڕین، كە ئەوەش ئاواتی هەموو كەسێكە كە پەیامێكی لە ژیاندا هەبێو لە هەوڵی گۆڕینو سازكردنی ژیاندا بێت.

# شانۆی بەهار

یوسف واژەیی

ئەمڕۆ بەزمی پێکەنینو ئاشتبوونەوەی داروگوڵو چرۆو چڵو دەشتو دڵە، شینی بەفرو شایی لوتکەو بە گژی یەکترا چوونی خەندەو کوڵە، وەرزی خەنینەوەی کۆرپەی گیاوگژو نازکێشانی دایکەگڵە، نمایشی خونچەی باخو ئاهەنگی هەنگی چالاکو شاگەشکەبوونی بوولبوولە، بەهار شانۆی سەمای پەپولەی بێدەنگو کەرنەڤاڵی کەوی شەنگو کۆتری بە گمەو مەنگە، شاییو لۆغانی نێرگزو گوڵاڵەی لاقەدو نواڵەو گەزیزەی لە سەرما زیزە.

ئەمڕۆ ڕۆڕۆی بەستەڵەکو بەستەی شەماڵی شادییە، نێرگزی تەڕ ڕەمزی خۆرو ئازادییە، ئاونگو خۆر هەرایانە لەسەر ماچی ڕوومەتی گوڵاڵە سوورە، سەوزەگیا نەیهێشت سنووری وەردو بوورە، نەك هەر مەلان تەنانەت وەرزی ژیانەوەو جووڵانەوەی مارو موورە، هەرقەڵبەزەو بە باڵای خۆیا هەڵئەڵێو ئەهاژێنێ، هەر دەوەنەو چاوەڕێی نەسیمی نەرمە تا خەڵفی تازەی ڕاژێنێ، پەرچەمی سەوزی داهێنێ.

سوێسکەو ڕیشۆڵەو پاساری بە ئاساری ئەم ئازارە بێئازارو مەستی مەستن، گەرووی هەموو باڵندەکان پڕ هەڵبەستن، شەوان چاوەڕێی لایلایەی تاقتاقکەرەن تابخەونو بەیانیان قاسپەی خاسەکەو تا هەڵبستن.

بست بە بستی ئەم خاکە لێو بە خەندەیە بۆ پێشوازی خاکە لێوە، تەنانەت بەردیش گیا ئەگرێو ئەژێتەوەو خەندەی پێوە، سروشت یەکپارچە دەرمانەو ئەچێتە دڵی توێتوێوە.

گوێچەم بە شەپۆلو خوڕە کەڕوکاسە، دەمی هەر ئەشکەوتو غارێ دەکەوێتە بەر هێرشی سەوزاییو تەڕی بەهارێو جێگەی تێرامانو باسە.

چاوودڵی هەموو سەرچاوەیەك ڕوونە، زەماوەندی کۆچی شەختەو زووقمو تەرزە لە ناوچوونە، هەمووسەرتەختو تەبارێ لەبارە بۆ سەیروسەیران، ئەم بەرگەجوانەی بەهارە، بەرهەمی دەستو مقەستو سەلیقەی پەروەردگارە.

داری مازوو هەرزوو خۆی پۆشتە کردەوە، بەڕوو ڕووی ڕووتی شاردەوە، درەخت یەك یەكو سەرلەبەر بوونەوە هاوڕێی سنەوبەر.

لەسەر هەر خەرمانو تەختێ نەختێ ڕائەکشێی، هەربۆنی گیای تەڕو هەڵمو هالاوی زەبەنگە، شکێنەری قفڵو کۆتی دڵی تەنگە. سروشت ئامێزی بۆ ڕۆحمان کردۆتەوە، ئەمڕۆ لە هەمووشت زیاتر ئەو گرەوی خۆشەویستی بردۆتەوە.

لەسەر شانازی بە خۆیان ئاسمانو زەوی شەڕیانە، ئەو بە باسی نوورو ڕووناکی خۆرەکەی، ئەم بە دەشتە ڕەنگاڵەو جۆراوجۆرەکەی، ئەو بە مانگەکەی تابانی ئەم بە هەڵقوڵینو لەنجەو ڕوونی کانی، ئەو بە تریفەی ئەستێرە ئەم بەم چیمەنو زەنوێرە، ئەو بە بێگەردیو ساماڵی ئەم دەسماڵی سەوزو ئاڵی، ئەو هەوری سپی گەواڵە ئەم بژوێنی لا نواڵە.

ئەوەی لەم پێکهەڵپڕژانە سوودی دیبێ، گەوهەری وشەی چنیبێ، منی شاعیری دڵتەڕم بەم جەنگە زمانم پژا، ئەسرینی چاوانم ڕژا، پێنووسەکەم بەڕووی وەسفی ئەم شاکارەدا هەڵگژا.

ئەڵێم خۆزگە منیش وەکو سروەی شەماڵ بمتوانیبایە ماڵ بە ماڵ لە دەرگای دڵی هەر گوڵێکم بدایە، یا باوەشێنی هەڵاڵەم بکردایە، پەیامی هەر یەکەیانم بۆ ئەوی تر ببردایە، بۆیە شەماڵم خۆش ئەوێ، حەز ئەکەم منیش وەکو ئەو پشکی سەربەستیم بەرکەوێ، چونکە ئەو تێکڕاو هەم بە جیا داروگیا چاڵو چیا، دادپەروەرانە ئەگەڕێو گشتیان بەسەر ئەکاتەوە، دڵی هەمووان ئەداتەوە، مژدەی جوانیو ڕەنگو بەرامەی ئەم وەرزە بە بست بە بستی ئەم ئەرزە ئەبەخشێتو جەژنانە ئەبەخشێتەوە...

ئێرەیی بە بولبول ئەبەم لە دیوەخانو مەجلیسی گوڵستانا، چۆن مەستانە شانی لەسەر سەرینی گوڵێك دائەداو بانگی چریکەو مەقامی بە گوێی هەموو گوڵجاڕی دنیادا ئەدا.

حەزم دەکرد منیش وەکو ڕشێنەو تاوی بەهاران لە نزاران لە لاقەدو لە کۆساران، بە خوڕەم بباریمایەو ببومایە ڕۆحو گەشەی هەموو پنجو شیناوەردێك، ببوومایەتە هۆی نەشەی هەموو سەوزو سوورو زەردێك، یان قوڵپی کانی بن بەردێك...

پەپوولە چەند بەختەوەرە بەو تەمەنە کورتو کەمەی مەستی گەمەی ناو چەمەنە، ئەو لە گوڵ زیاتر ناناسێ، لە بەهار زیاتر نابینێ، تاپێی سەرسام بێو بتاسێ. ئاشنای باخی ڕەنگاوڕەنگە، بۆیە ڕەنگە وابزانێ تەمەن هەمووی هەر بەهارە.

من لە نزمیم چاوم تێرنابێ لە جوانی، ئەبێ مەلو باڵندەکانی ئاسمانی، چۆن بەم بەهەشتی زەمینە بەربەرینە شاگەشکەو سەراسیمەبن؟

ئەمڕۆ چی لە چنار هەناوی تەڕترە، چی لە گوێزو چوالەو هەرمێ بە فەڕترە؟ کێ پۆشاکی ئاڵو واڵای لە باڵا دێ وەکو کوێستان؟ کێ بە گوڵو تەرزی خۆیەوە ئەنازێ وەکو بێستان؟

وادەزانم پەلکە زێڕینەش لە عیشقو عەزرەتی ئەم نمایشە پشتی کووڕو چەماوەیە، بۆ ساتێکیش جێ بەخۆی ناگرێو تەمەنی کەم خایەنو کەم ماوەیە.

هیچ کات شوانو شمشاڵەکەی وەکو ئەمڕۆ هاوەڵ نەبوون، شمشاڵو ئاوازەکانی تێکەڵ نەبوون، مێگەل هۆگری لاقەدو جەنگەڵ نەبوون، کەشو هەوا بە ئارەزووی ئاژەڵ نەبوون، قەت ئەوەندە بێزار لە کۆزو کولانەو ئاغەڵ نەبوون..

خاك لە خاکی بوون کەوتووەو لە هەموو شتێ زیاتر بە خۆی دەنازێ، بەو بە خۆنازینەشەوە لەگەڵ هەموو خاوەن دڵێکا ئەسازێ، یەك بە یەك ئەیاندوێنێ هەریەك بە ئاهەنگو ڕازێ.

هیچ کەس هەست بە غوربەت ناکاو سروشت بۆ هەموو هاوڕێیەك ئاوڕیی جوانی ئەداتەوە، مەینەتیو خەم دەباتەوە، ژەنگو پەنگی ڕابردوویان ئەڕەوێنیو ئەشواتەوە.

هەناسەی شێداری نەورۆز پڕە لە ئاسایشو سۆز، بێگەردو تۆز شنەیەکە پاکو پیرۆز، کوانوی دڵە خامۆشەکان خانووی هەناوە تاریکو ناخۆشەکان دەروونە پەردە پۆشەکان. سەر لە نوێ ئەژێنێتەوە، ئاوەدانیو ژیانی نوێیان دیسان بۆ دەهێنێتەوە.

خۆر لە دەمی ئاوابوونیا ڕەنگ زەردی جێهێشتنی ئەم شانۆیەیە، نوقمی ئامێزی خەمی ئەم ئاسۆیەیە، بەکزی سەردەنێتەوە، نیگەرانە تاسبەینی هەڵدێتەوە، پەردە لەسەر نمایشێکی کەی بەهار لادەداتو چاوی ئەویشو ئێمەشی دیسان پێ ڕوون دەبێتەوە...



دیمەن حەیدەر



# منداڵ... بەخششێکی دوولایەنە

ئاشکرایە منداڵان بەشێکی سەرەکیو گرنگی کۆمەڵگا پێکدەهێنن، هۆکاری بەردەوامبوونی ژیانو خۆشبەختکردنی زۆرینەی خێزانەکانن، کە خواوەند وەك بەخششێك توانای هێنانەکایەی داوە بە مرۆڤەکانو مرۆڤیش وەك جێنشینێکی خۆی، لە دوای خۆی بە جێی دەهێڵێت، هەمیشە کاتێك ناوی منداڵ دەهێنرێت وێنایەکی جوان لە خەیاڵو هزرماندا دروست دەبێت، هۆیەکەشی ئاشکرایە کە سەراپا سروشتی منداڵان هەموو جوانییەکانی لەخۆ گرتووە، ئەوان بوونەوەرێکی پاكو روونن، سادەو ساکارن، سەرنجڕاکێشن، بە هەڵسوکەوتەکانیان تووشی سەرسوڕمانمان دەکەن، هەموو ئەمانە بۆچی؟ لەبەرئەوەی ئەوان ڕاستی ناخی مرۆڤەکان ئاشکرا دەکەن، دەمانگەڕێننەوە بۆ سروشتە بنەڕەتییەکەی خۆمان کە هێشتا ژیانو ئاڵۆزییەکانی ناوی یەخەی پێ نەگرتوونو ناوێرن توخنی سروشتە ناوازەکەی منداڵان بکەون. ئەوان یەك لایەنەو تەنیا بۆ خۆیان ناژین، بەڵکو دوو لایەنی گرنگیان لە ژیاندا بەرجەستە کردووە، کە لێرەدا ئەو دوولایەنە ڕوون دەکەینەوە:

هەموومان ئەوە دەزانین کە منداڵ وەك هەویر، یان ئیسفەنج وایە، واتە مرۆڤەکان دەتوانن دروستی بکەنو پەرەی پێ بدەن بەو جۆرەی مەبەستیانە بە مانایەکی تر چۆنییەتی دروستکردنی خووڕەوشتو کەسێتییەکەی لە دەست هەردوو سەرۆك خێزاندایە، لەبەرئەوەی منداڵ پێویستی بە سەرپەرشتیارێکی لە خۆی بە ئەزموونترە کە ئاراستەی بکاتو پێی بگەیەنێت، جا بە شێوەیەکی پۆزەتیف بێت، یان نێگەتیف، لێرەدا منداڵان پێویستیان بە هاوکاری کردنە لە لایەن گەورەکانەوە، ئەمەش لایەنێك لە لایەنەکان کە دەتوانین بە لایەنی (وەرگر)ی منداڵ وەسفی بکەین، لە بەرامبەردا گەورەکانیش پێویستییان بە منداڵان دەبێت بۆ فێربوون، کە دەتوانین بە لایەنی (بەخشەر)ی منداڵ وەسفی بکەین، کە مەبەستی سەرەکی باسەکەمانە، منداڵ لە ڕێی ئەم لایەنەوە چەندین وانەی گرنگمان فێر دەکات، شتێکی نامۆ نییە ئەگەر ویستمان لە منداڵانەوە فێر بین، چونکە زۆر کەس پێیان وایە کە تەنها فێرکردن کاری گەورەکانەو منداڵان دەبێت فێر بکرێن، بەڵام لە ڕاستیدا مرۆڤ لەگەڵ گەورەبوونیو تێپەڕاندنی قۆناغی منداڵی بە هۆی گۆڕانکارییە فیسیۆلۆجیو ژینگەییەکانی دەورووبەرییەوە هەندێك لە سیفاتە بنچینەییو بنەڕەتییەکان لە ژیانیدا ون دەکاتو بۆ دۆزینەوەشیان ناچارە پەنا بۆ منداڵان بەرێت، چونکە ئەوان تەنها کەسێکن دەتوانن ساکارانەو بەبێ منەت زۆر شتی سادە، بەڵام گرنگمان فێر بکەن لەوانە:

**١-پێکەنین بەدەم ژیانەوە:** گرنگترین شت لای منداڵان کە زۆرترین دووبارە بوونەوەی هەیە پێکەنینە بە دەم ژیانەوە، بە بێ دانانو دیاریکردنی مەرجێك بۆ پێکەنینەکانیان، ئەوان زۆر پێدەکەننو بە ئاسانی دەیبەخشنە دەوروبەرەکەیان، ئەمەش بە نیسبەت گەورەکانەوە خاڵێکی گرنگە، لەم ڕۆژگارەی ئەمڕۆ کە جەنجاڵیو کێشە زۆرو زەبەنەکانی دونیاو سەرقاڵیو خەمە جۆربەجۆرەکان بواری زەردەخەنەیەکیش بۆ مرۆڤ ناهێڵنەوە، کە ئەگەر ئاگای لە خۆی نەبێت دوور نییە تووشی کێشە ببێتو دواجار لە ڕووی دەروونییەوە خەمۆکی بیگرێتەوە، هەر بۆیە لە توێژینەوە سایکۆلۆژییەکاندا پێکەنین وەك چارەسەرێك بۆ زۆرینەی نەخۆشییەدەروونییەکانو تەنانەت جەستەییەکانیش دادەنرێت، چونکە دەروونو جەستە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆ لە نێوانیاندایەو کاریگەری نەخۆشییە دەروونییەکان ڕاستەوخۆ لە ڕووکاری دەرەوەی مرۆڤدا هەستی پێ دەکرێت، تەنانەت بۆ ئەو کەسانەش کە بە ئەستەم دەتوانن پێبکەنن ئامۆژگاری دەکرێن کە ڕۆژانە لانی کەم ٢٠ خولەك پێبکەنن، ئەگەر چی بە زۆریش بووبێت، بۆیە پێکەنین بەدەم ژیانەوە گرنگەو وا لە مرۆڤ دەکات بە شێوەیەکی گەشبینانەتر لە ژیان بڕوانێتو دواتر لە ڕاپەڕاندنی کارەکانیو زاڵبوون بەسەر بەربەستەکاندا سەرکەوتوو بێتو پاشانیش خاوەنی دەروونو جەستەیەکی تەندروست بێت.

**٢- ژیان لە ئێستادا:** خاڵێکی تری سەرنجڕاکێش لای منداڵان ئەوەیە لەو ساتە وەختەدا سەرقاڵ دەبن کە تیایدا دەژین، ئیدی خۆ خەریککردن بێت بە تەماشاکردنی ڤالۆنچەیەك، یان بە سەرنجدانو وردبوونەوە لەو شتانەی لە دەورووبەریدان، بەم شێوەیە بە تەواوەتی سوود لەو ساتە وەختەی کە تیایدا دەژین دەبیننو چێژی لێ وەردەگرن، بە پێچەوانەوە هۆکاری سەرەکی بێ ئۆقرەییو نیگەرانییەکانی مرۆڤ هەر لێرەدایە، بە هۆی زۆر بیرکردنەوە لە داهاتوویانو ئەگەری ئەو ڕووداوو پێشهاتانەی دێنە ڕێیان، یان بە نوقوم بوونیان لە ڕابردوویانو وەبیرهێنانەوەی ڕووداوو کارەساتەکانو خەمخواردن پێیان، ئیدی لەم نێوانەدا ئەوەی دەمێنێتەوە لە کیسچوونی ساتە وەختی ئێستایانەو ناتوانن بە تەواوەتی سودی لێ ببینن، بێ ئاگا دەبن لەوەی کە ئەوەی داهاتووی ڕوونمان بۆ دروست دەکاتو شانازی بە بەسەربردنی تەمەنی ڕابردوومان دەبەخشێت تەنهاو تەنها لە ئێستادا ژیانە.

**٣- گوێ نەدان بە بارودۆخ:** منداڵ هەرگیز بارودۆخو کەشو هەوا ناکات بە بیانوو بۆ جێبەجێ نەکردنی ئەو کارانەی دەیەوێتو ویستی لەسەریەتی کە ئەنجامیان بدات، بۆ ئەمەش بێگومانم زۆربەتان سەرنجتان داوە لە کاتە گەرمو بێزارکەرەکانی هاویندا کۆمەڵێك منداڵ لە کۆڵانەکاندا کۆبوونەتەوەو سەرگەرمی یاریکردنی خۆیانن، بێئەوەی هیچ جۆرە بێزارییەك دەربڕن، بە پێچەوانەوە زۆر بە خۆشحاڵییەوە چێژی لێ دەبینن، یان لە مانگە ساردەکانی زستان بە هەمان شێوە بەشێوەیەك سەرمان لەو تامەزرۆییەی ئەوان سوڕ دەمێنێت بۆ تەنها وازییەك کە خۆشیو بڕوا بەخۆبوونیان پێ دەبەخشێت، لێرەدا کاریگەرییە نێگەتیفە تەندرووستییەکان کە بەم هۆیەوە دروست دەبێت باسی ئێمە نییە، بەڵکو دەمەوێت ئەوە بڵێم ئەو بەم کارانەی دەیەوێت ئەوەمان بۆ بسەلمێنێت کە هیچ شتێك ناتوانێت ببێتە ڕێگر لە بەردەو پێشچوونی ئەو کارانەی بە لامانەوە، گرنگەو دەمانەوێت ئەنجامیان بدەین بە مەرجێك سوور بین لە گەیشتن بە مەبەستەکانمانو ڕێگە نەدەین بیانووە جۆربەجۆرەکان ڕێگای سەرکەوتنمان لێ ون بکەن. چوونکە ئامانجەکان زۆر لەوە گرنگترن کە بارودۆخ ڕێگریان بێت.

**٤- سەرکێشی:** لە سەردانی شاری یاریدایەو سورە لەسەر سەرکەوتنی بەسەر ئەو یاریانەی خۆی داوای دەکات، هەرچەندە دایكو باوك دڵنیای دەکەنەوە لە ئەگەری ترسناکیو نەگونجانی ئەو یارییە، بەڵام سوودی نییەو هەر پێداگری دەکات، ئەمە سیفاتی ئەو منداڵانەیە کە ڕۆژانە لەگەڵ خێزانەکانیان سەردانی شاری یاری دەکەن، لە ڕاستیدا منداڵ پێویستی بە تاقیکرنەوەی شتەکانە بۆ ئەوەی فێر ببێتو منداڵێکی زیرەكو وریای لێ دەربچێت، کە ئەمەش لە زۆرکاتدا بە سەرکێشی نەبێت ناتوانێت ئەنجامیان بدات، بۆیە زۆرجاریش لە لایەن دایكو باوکەوە بە (ئینکار) وەسف دەکرێت، بەڵام لە ڕاستیدا ئەمە زۆر پێویستە بۆیانو لەم ڕێگەیەوە دەتوانن ئاستی بوێریو تواناکانی خۆیان تاقی بکەنەوەو لە شتەکانی چواردەوریان تێ بگەن، ڕاستە هەندێك کات سەرکێشی بۆ گەورەکان سوودی نییەو پێویستە باوەڕمان بە قەدەر هەبێت، چونکە هەندێك شت لە چارەنوسمان نوسراونو ناتوانین بیانگۆڕین، بەڵام ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت دەستەوسان بین لە بەرامبەر ئەو شتانەی حەزمان لێی هەیەو ترس لە تێپەڕبوون بەو تاقیکردنەوانە ڕێگرمان بێتو سڵیان لێ بکەینەوە، بەڵکو پێویستمان بە تاقیکردنەوە دەبێت، گرنگ نییە تیایدا سەردەکەوین، یان نا، گرنگ ئەوەیە بتوانین تواناکانمان تاقی بکەینەوە، بۆ ئەمەش منداڵان نموونەیەکی ڕوونن، چونکە ئەوان بۆ جارێك، یان ئەگەر بۆ چەند جارێکیش بووبێت خۆیان بە تاقیکردنەوە ترسناكو قورسەکاندا دەبەن هەتا تیایدا سەردەکەون، هەر بۆیە لە چەندین شوێندا گوێمان لەمە دەبێت کە (تاقیکردنەوە باشترین بەڵگەیە!).

**٥- ڕاستبێژی:** لە کۆنەوە وتوویانە (ڕاستی لە دەمی منداڵانەوە ببیستە) منداڵ یەکەم کەسە کە دەتوانین باوەڕی پێ بکەینو ڕاستی لێ وەربگرین بە مەرجێك بارودۆخو ژینگەی دەوروبەری سروشتەکەی نەشێواندبێت، هەروەك ئەو چیرۆکەی پادشاو دوو بەرگدرووە فێڵبازەکە، کە نیازیانە پادشای وڵاتێك هەڵبخەڵەتێننو بە حسابی خۆیان بەرگی ئاوریشمی گرانبەهای بۆ بدرون، لەبەرامبەر پارەیەکی خەیاڵیدا، لە پاش چەندین ڕۆژ لە چاوەڕوانی پادشاو خەڵك، سەرەنجام پێی ڕادەگەیەنن کە جلەکانی تەواو بووەو دەتوانێت لەبەریان بکات، لە پاشان پاشاکە دەبەنە ژوورەوەو جلو بەرگە نوێیەکەی لەبەر دەکەن، بەم بۆنەیەشەوە پادشا خەڵکی شارەکە بانگێشت دەکات بۆ بینینی جلوبەرگە ئاوریشمەکەی، بەڵام هەرکە پادشا دەردەکەوێت لە دەروازەی کۆشکەوە دەبینن کە پادشاکەیان هیچی لەبەردا نییەو پادشاش خۆی بە گومانە، بەڵام کەس لە ترسی پادشا ناوێرێت ئەم ڕاستییە دەربخاتو هەمووان بە چەپڵەڕێزانەوە پێشوازی لێ دەکەن، تا لە ناکاو منداڵێك لەناو خەڵکەکەدا هاوار دەکات: ئەرێ خۆ پادشا هیچی لەبەردا نییە، بۆچی هەمووان پیرۆزبایی لێ دەکەن،ئیتر پادشا لێرەدا تێدەگات!

**٦- منداڵ هەموو کەسەکان لە یەك ئاستدا دەبینێت:** منداڵ هەموو کەسەکان بە هەژارو دەوڵەمەندو کرێکارو خاوەن سەرمایەو پلەو پایەی کۆمەڵایەتیو پیرو گەنجو جوانو ناشیرین لە یەك ئاستدا دەبینێت، بە مەرجێك بیدوێنی ئیتر ئەویش بە ئاسانی لەگەڵتدا ئاشنا دەبێت، نەوەك زۆرینەی گەورەکان کە پلەو پایەی کۆمەڵایەتی ڕاستەوخۆ کار لە چۆنییەتی هەڵسوکەوت کردنو تێڕوانینو بیرو بۆچوونەکانیان لە بەرامبەر کەسەکاندا دەکات.

لە کۆتاییدا دەتوانم بڵێم بەشێك لەو یادگارییە خۆشانەی خۆمان کە هەر لە منداڵییەوە بۆمان ماوەتەوە، هەر بۆ ئەم هۆکارانە دەگەڕێتەوە کە گەورەکان وا لێ دەکات بە تاسەی ئەو ژیانە سادەو ساکارەی جارانەوە بن، ئەو منداڵییەی کە هەموو جوانییەکانی تێدا یەك دەگرنەوە، بەڵام دەبێت ئەوەشمان لە یاد نەچێت کە ئەمانە ئیدی کۆتاییەکەی نییە، بەڵکو مرۆڤ پێویستی بە گەورەبوونو تێپەڕاندنی قۆناغەکانە هەتا بتوانێت پشت بە خۆی ببەستێت، پێویستیشی بە فێربوون دەبێت.

یەکێك لەو هۆکارانەی فێربوونیش منداڵانن کە دەتوانن سەرلەنوێ هاوسەنگیمان بۆ بگەڕێننەوەو لە بارە نائاساییەکان دەرمان بهێنن. ئەوان لەم ژیانەدا پەیامێکی گرنگیان بۆ ئێمە پێیەو پێمان دەڵێن وەرن با لەساتە وەختە ناجۆروو قوورسەکاندا وەڵامی خەمەکانمان بە زەردەخەنەیەك بدەینەوە، دەڵێن کاتو ساتە وەختەکان گرنگنو تەمەنی مرۆڤیش دیاریکراوە با پێش ئەوەی ڕێگەیان بدەین بمانبرن ئێمە ئەوان بەخۆشیو گەشبینییەوە ببڕین.

دەڵێن وەرن ژیان بە هەوڵو تێکۆشانەکانی ئێمە جوانتر دەبێتو بەبێ ماندووبوون چێژی حەساوەیی ناکەین، دەڵێن وەرن با ژیانو سەیروسەمەرەکانی تاقی بکەینەوە تا ئەزموونێك پەیدا بکەینو بەبێ ئەزموونو بە چاونوقاوی تێی نەپەڕێنین، دەڵێن وەرن با ڕاستگۆییو ڕاستبێژی بکەینە پیشەو ڕێگە نەدەین ترس لە لەدەستدان ڕاستییەکانمان لێ بشێوێنێتو متمانەی خۆمانو دەوروبەرەکەمان لێ بسەنێت، چونکە ڕاستگۆیی قەڵایەکە هەتا مردن لە دەوری خاوەنەکەیدایەو نهێنی سەربەرزیو سەرکەوتنی لە خۆیدا حەشارداوە، هەروەها دەڵێن لە کۆتاییەکەیدا ئێمە هەموو لە ژێر ناوێکدا یەك دەگرینەوە ئەویش مرۆڤە، خاوەنی هەرشتێك بینو هەرچەند پلەوپایەمان بەرز بێت، دواجار هەر ئەو مرۆڤەین کە دەبێت تامی مردن بکەینو ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەم دونیایە بەجێ بهێڵین، کە ئەمە سەرئەنجامی هەر یەکێکمان بێت بۆچی ئەوەندە بە توندی دەستی پێوە بگرینو دواجار کە دەستی بەرداین تووشی شۆکمان بکات، نا بائیدی هەموومان دەست لە ناو دەست درێژە بە ژیان بدەینو کاتێکیش کۆتاییمان هات بە ڕوویەکی خۆشەوەماڵئاوایی لێ بکەینو چاوەڕێی دیداری یەکتر بین لە دونیای هەتاهەتایی.

# من منداڵی سێهەم بووم



ئا: بەرزان ئەبوبەکر

من منداڵی سێهەمی دایکم بووم، ئەو کاتەی چاوم بە دنیا هەڵهێنا دایکم تەمەنی ٢٥ساڵان بوو، دایکم دەیگوت: ئەو ساتەی لە نەخۆشخانە لە دایکبوویت، برینپێچەکان بێنەوەی ڕێگە بدەن من بتبینم هەڵیانگرتیتو بردیانیت بۆ ژوورێکی دیکە، پاشان ئەو پزیشکەی سەرپەرشتی لە دایکبوونەکەتی دەکرد، هات بۆ لامو پێی گوتم: کە منداڵەکەت واتە من، دەستی چەپی تەواو نییە، لە مەچەکی بەرەو خوار نییەتی، لەبەرئەوە زۆر بە دڵسۆزییەوە کۆمەڵێك ئامۆژگاریی کردمو وتی: تکا دەکەم بەشێوەیەکی جیاواز لە منداڵەکانی دیکەت مامەڵەی لەگەڵدا مەکە، نەکەیت بە چاوی ڕقو سووکەوە بۆی بڕوانیت، بەڵکو ئەو زیاتر لە منداڵەکانی ترت پێویستی بە چاودێریو دڵدانەوەو لاواندنەوە هەیە، تکایە هەرگیز لەبەرچاوی کچەکەتدا نارەزایی دەرمەبڕەو هەستی بریندار مەکە، ئەگەرچی ئێستا ساوایەو لەو ڕەفتارانە تێناگات، بەڵام خودا تەمەن بدات ڕۆژێك دادێت لە هەموو هەستو نەستو جوڵانەوەیەکت تێدەگات، لەبەرئەوە هیوادارم دایکێکی میهرەبان بیت بۆ ئەم منداڵەتو ببیتە نموونە بۆ هەموو ئەو دایکانەی منداڵی کەمئەندامیان هەیە. دڵنیابە خودا بەم منداڵە تاقیکردوویتەوە، هیوادارم لەو تاقیکردنەوەیەدا زۆر سەرکەوتوو بیت!

ئێستا کە من گەورە بوومو ژیانو بەسەرهاتی خۆم بۆ ئێوەی ئازیز دەگێڕمەوە دەتوانم بڵێم: دایکم زۆر زیاتر لە ئامۆژگارییەکانی پزیشکەکە چاودێری کردوومو گرنگی پێداوم..

ئەو کات من تەمەنم حەوت ساڵان بوو، دایکم کە خاوەنی پێنج کچ بوو، بۆ پەیدا کردنی بژێوی ژیانمانو هاوکاریکردنی باوکم لەو بوارەدا ناچاربوو ڕوو لە کارکردن بکات، ئێمە ئەو دەستە خوشکە کاروباری نێوماڵمان بەڕێوە دەبرد، تا بتوانین هاوکاری دایکمان بکەین، جارێکیان لە چێشتخانەکە هاتمە دەرەوەو زۆر بە توڕەیی هاوارم کرد، من ناتوانم پەتاتە پاك بکەم، چونکە من تەنها یەك دەستم هەیە!

لەو کاتەدا دایکم سەرقاڵی کارکردن بوو، کاتێك دەنگی توڕەیی منی بیست، دەستی لە کارەکەی خۆی هەڵگرتو بەرەو لای من هاتو پێکەوە چووینە چێشتخانەکە، پێی وتم: کچی شیرینم هیچ کات لە دەست کارەکان دەستەوسان مەبە، هەموو توانات بخەرەگەڕ بۆئەوەی بتوانیت ئەو کارەی دەتەوێت ئەنجامی بدەیت، هەرگیز نامەوێت جارێکی دی لە زاری تۆ ئەم جۆرە سکاڵایە ببیستم.

پاشان فێری کردم کە چۆن پەتاتە پاك بکەم، وتی: بە دەستی ڕاستت چەقۆکە بگرەو بە قۆڵی چەپیشت پەتاتەکە، دایکم بۆ ئەنجامدانی هەر کارێك شێوەو ڕێگەیەکی بۆ دادەنام، هەموو جار دەیگوت: ئەگەر مرۆڤ تواناکانی بۆ ئەنجامدانی هەر کارێك چڕ بکاتەوە، ئەوا دەتوانێت هەر کارێك بیەوێت ئەنجامی بدات!

ئەو کات لە پۆلی سێیەمی سەرەتایی بووم، ڕۆژێکیان لە وانەی وەرزشدا چووینە گۆڕەپانی قوتابخانە، هەموو منداڵەکانم بینی بازیان دەداو بەسەر یارییەکاندا خۆیان هەڵدەواسیو لەم شیش بۆ ئەو شیش بە دەستەکانیان بۆ پێشەوە دەڕۆیشتنو جوڵانەیان دەکردو ڕاهێنانی بەهێزبوونی ماسوولکەکانی دەستیان ئەنجام دەدا، کاتێك نۆرەی من هات، ترسامو پاشەکشەم کرد، نەمتوانی ئەو یاریانە بکەم کە هاوپۆلەکانم دەیانکرد، هاوڕێکانیشم دەستیان کرد بە پێکەنین، منیش بە گریانەوە بەرەو ماڵ گەڕامەوە.

کاتێك شەو داهات دایکم وەکو نەریتی هەموو ڕۆژێکی بە وردی هەواڵی قوتابخانەو



وانەکانی دەپرسیم، ئیدی منیش بە چاوی پڕ لە ئەسرینەوە ڕووداوەکەم بۆ گێڕایەوە، دایکم لە ئامێزی گرتمو دڵنەوایی کردمو وتی: چاوەڕێ بکە بە پشتیوانی خودا هەموو شتێك چارە دەکەین.

بۆ ڕۆژیی دوایی دایکم هات بۆ قوتابخانەو چاوەڕێی کرد تا دەوامی قوتابخانە تەواو بوو، پاش ئەوەی دەوام تەواو بوو، لەگەڵ دایکمدا ڕۆیشتینە گۆڕەپانی قوتابخانە بۆ ناو یارییەکان، پاشان دایکم ڕێنمایی کردم بەرەو ناو یارییەکانو وتی: (ئێستا هەوڵ بدە تەنها بە دەستی ڕاستت خۆت هەڵبواسیت) خۆیشی لە تەنیشتمەوە وەستابوو، منیش هەوڵمدا خۆم بە یارییەکانەوە هەڵواسم بە بەکارهێنانی دەستی ڕاستمو قۆڵی چەپم، ئیدی لەو ڕۆژە بەدواوە هەموو ڕۆژێك دایکم لەگەڵمدا دەهاتو ماوەی یەك کاتژمێر ڕاهێنانی لەسەر یارییەکانو خۆ هەڵواسین پێ دەکردم، تا گەیشتمە ئەو ئاستەی زۆر بە سانایی‌و سەرکەوتوویی تەواوی یارییەکان ئەنجام بدەم..

هەرگیز ئەو ڕۆژەم لە یاد ناچێت، جارێکی دیکە هەر لە وانەی وەرزشدا مامۆستاکەمان بردینیەوە بۆ گۆڕەپانەکەو قوتابیان ڕیزیان گرتبوو، تا هەر یەکێك نۆرەی بگاتی‌و یاری خۆهەڵواسین‌و بەرزبوونەوە بکات، کاتێك نۆرەی من هات، قوتابیان چاوەڕێیان دەکرد پاشەکشە بکەمو نەتوانم یارییەکە ئەنجام بدەم، بەڵام کاتێك بینیان زۆر بە سەرکەوتوویی‌و بە تەنها دەستێك هەموو یارییەکانم ئەنجامدا، چاویان ئەبڵەق ببوو، بە تەواوی سەریان سوڕمابوو! منیش بەوپەڕی دڵخۆشییەوە بە تیلەیەکی چاو سەیرێکی ئەو کەسانەم کرد، کە لە جاری پێشوودا گاڵتەیان پێ کردبووم!

دایکم بەردەوام لە هەموو هەنگاوەکانمدا لەگەڵمدا بوو، ئەو بۆ ئەنجامدانی هەر کارێك بیرۆکەیەکی نوێی فێر دەکردم تا شتێك نەبێت لەم ژیانەدا من بڵێم ناتوانم ئەنجامی بدەم، هەرگیز نەیدەهێشت هەست بە کەمی بکەم، بە هۆی نەبوونی دەستی چەپمەوە، تەنانەت زۆرجار من توڕە دەبوومو لە دڵی خۆمدا دەمگوت دایکم نازانێت من چەند دووچاری دەردەسەری‌و ناڕەحەتی دەبم، ئەو گرنگی نادات بەو ناڕەحەتییە زۆرەی کە دووچارم دەبێت لە کاتی ئەنجامدانی ئەو کارانەدا!

بەڵام من هەر کاتێك دووچاری ناڕەحەتییەك ببوومایەتەوە، یان گرفتێك ڕووی تێ بکردمایە، دەڕۆیشتمە ژوورەکەی خۆم تا بە تەنها بەمو تێر تێر بۆ حاڵو گوزەرانی خۆم بگریم، بەڵام دەستبەجێ دایکم دەهات بۆلامو زۆر بەسۆزو میهرەبانییەوە پرسیاری لێ دەکردم: کچە شیرینەکەم ئەوە چیتە؟ کاتێك هۆکاری گریانەکەم پێ دەگوت، کەمێك بە چاوە جوانەکانی سەیری دەکردمو پاشان دەیگوت: هیچ نییە خۆم چارەسەری دەکەم! زۆرجار کاتێك بە قوڕگی پڕ لە گریانو چاوی پڕ لە ئەسرینەوە قسەم بۆ دەکرد، سەیرم دەکرد دایکیشم هۆن هۆن فرمێسك بە ڕووخساریدا دێتەخوارەوە، لە ڕاستیدا ئێستا دەزانم دایکم چەند لەگەڵ مندا ماندوو بووەو ناڕەحەتی چەشتووە، تەنانەت زۆرجار نەیدەهێشت من بە گریانو خەمەکانی بزانم، نەبادا من دڵتەنگو نیگەران بم!

لە ماوەی ڕۆژگارەکانی ژیانمدا، دایکم گەورەترینو باشترین هاوڕێ‌و هاودەمم بوو، هەر کات دەمویست کەمێك لە خەمو ناڕەحەتییەکانم بە فرمێسکی چاوەکانم دەربڕم، دڵنەوایی دەکردمو ئارامی دەکردمەوەو نەیدەهێشت بە تەنها بم، کاتێکیش گەورە بوومو خوێندنم تەواو کردو بوومە فەرمانبەر، پاشان چوومە نێو ژیانی هاوسەرییەوە، ئێستا ژیانێکی زۆر ئاسوودە لەگەڵ هاوسەرە ئازیزەکەمدا دەگوزەرێنینو خاوەنی چوار منداڵم!

بە داخەوە دایەگیانم چەند ساڵێك لەمەوبەر بە هۆی تووشبوونی بە نەخۆشی شێرپەنجەوە بۆ دواجار ماڵاوایی لێکردین، منیش هەرگیز ئەو دایکە بەڕێزەم لە یاد ناکەم، مامۆستام بوو، هاوڕێم بوو، دایکێکی دڵسۆزو میهرەبانم بوو، تەنها ئەو بوو فێری کردم، کە چۆن وەڵامی پرسیارە گرنگەکان بدەمەوە، ئەو کاتەی من منداڵ بووم، بەردەوام لە خۆمم دەپرسی بۆچی دەبێت من بەو شێوەیە خۆم ماندوو بکەم؟ بەڵام ئێستا وەڵامەکەی دەزانم، بەڕاستی ناڕەحەتی‌و نەهامەتی‌و ناخۆشییەکانی ژیان مرۆڤ دروست دەکات، من لە دایکمەوە فێری ئازایەتی‌و ورەبەرزی‌و هەوڵدان بووم!

بەو هیوایەی هەموو دایکێك بتوانێت بەو شێوەیە منداڵەکانی پێ بگەیەنێت، بە تایبەت ئەگەر خوانەخستە خاوەنی منداڵێکی کەمئەندام بوو.

# گەشتیار و بەهار

ئازاد محێدین

گەشتیاری ئازیز تۆ خوازیاری
شەیدای دیمەنی جوانی بەهاری
تامەزرۆی گوڵو گوڵاڵەی جوانی
شتەی شەماڵو جۆگەلەو کانی
تەزنەی بەفراوی هەواری خاڵ خاڵ
قاقبەی زەرەژو ئاوازی شمشاڵ
ئەمەو هەزاران دیمەنی جوانی
ئەگەر بەچاوی عەقڵ بڕوانی
وێنەی بەهەشتە ئەم کوردستانە
با بیپارێزین ئەرکی گشتمانە
گوڵو گوڵاڵە لێ مەکەرەوە
بەردی سەر ڕێگە تل مەکەرەوە
بکوژێنەوە ئاگرت بە ئاو
بەتاڵ بێ فەرهەنگ لە داوو لە ڕاوو
کانیاوی پاکی ڕابگرە بە پاك
بانەمەك داربین بەرانبەر بەخاك
هەڵسوکەوت بکە بەسنورداری
نەبیتە مایەی مەردوم بێزاری
پاشماوەکانت کۆبکەرەوە
بۆ شوێنی گونجاو دووری خەرەوە
سوپاسی خوا بکە هەتا دەتوانی
بۆ ئاسایش‌و نیعمەتەکانی
توری چاودکەم ڕێبوارو گەشتیار
بیر بکەرەوە لە پەندی بەهار
گوڵو گوڵاڵە ئەهۆنێتەوە
پەیامی حەشر ئەخوێنێتەوە

و: خالید محەممەد

# تۆ لە کام چوارگۆشەی ژیاندایت؟

لە ژیانی مرۆڤدا ڕۆچوم، بینیم دابەشدەبێت بەسەر چوار بەشدا، هەریەك لەو بەشانەشم ناونا (چوارگۆشە)، بیست ساڵیشم بۆ هەریەك لەو چوارگۆشانە دانا، وامدانا کە مرۆڤ هەشتا ساڵ دەژی.

ڕوانیم هەریەك لەو چوارگۆشانە بەرنامەو کارێکی هەیە کە جیاوازە لەوانی تر:

**چوارگۆشەی یەکەم:** لە لەدایکبوونی مرۆڤەوە دەست پێ دەکات، تاکو تەمەنی بیست ساڵی، ئەم تەمەنەش تایبەتە بە وەرگرتنو فێربوونو گەشەکردن.

**چوارگۆشەی دووەم:** لە تەمەنی بیستویەك ساڵییەوە دەستپێدەکات، تاکو تەمەنی چل ساڵی، کە تەمەنی کارو پەیداکردنی ڕۆزیو پێکەوەنانی خێزانە.

**چوارگۆشەی سێیەم:** لە تەمەنی چلویەك ساڵییەوە دەستپێدەکاتو تاکو شەست ساڵی بەردەوام دەبێت، ئەم تەمەنەش تەمەنی پێشکەشکردنی ئەزموونە بە کەسانی ترو بینینی ڕۆڵی مامۆستای وانەکانی ژیان.

**چوارگۆشەی چوارەمو کۆتایی:** لە تەمەنی شەستو یەك ساڵییەوە دەست پێدەکاتو لە هەشتا ساڵیدا کۆتایی دێت، ئەم قۆناغەی تەمەنیش بریتی دەبێت لە کاری سەرپەرشتیکردنو بەڕێوەبردنی ئەو دەستکەوتانەی کە لە چوارگۆشەکانی پێشودا بەدەستت هێناوە، هاوڕێ لەگەڵ چێژوەرگرتن لێیان.

لە هەر یەکێك لەم چوارگۆشانەدا شتگەلێکی تێدایە کە خۆشت دەوێنو تاموچێژو خۆشیان لێ وەردەگریت، هەروەك بەدەرنین لە ناسۆریو کێشەو ناڕەحەتی.. ڕەنگە هەندێجار تێکەڵاوی دروست ببێت لە نێوان چوارگۆشەکاندا، بۆ نموونە: ڕەنگە وەرگرتنو فێربوون بەردەوام بێت بۆ خوێندنی باڵا، فێرخواز لێرەدا پێدەچێت تاکو نیوەی چوارگۆشەی دووەمی تەمەنی بڕوات، هەروەك ڕێژەکان بە پێی ژینگەو ژیانی خەڵکی جیاوازنو دەگۆڕێن، کەسێك لەوانەیە سەرکەوتوو نەبووبێت لە پێکەوەنانی خێزان، بۆیە کارو ئەرکەکانی لە چوارگۆشەی دەووەمدا دەگۆڕێت، لە بری ئەوەی کار بۆ پێکهێنانی خێزان بکات بەردەوام دەبێت لە بەخشینەکانی بە کۆمەڵگە، یان لە هەوڵی تەواوکردنی پرۆژە تاکەکەسییەکانیدا دەبێت، یان خزمەتی خێزانە گەورەکەی خۆی دەکات.

گەر بەوردی سەرنجێك لەم ئایەتەی قورئانی پیرۆز بدەین کە دەفەرموێت:

﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ وَبَلَغَ أَرۡبَعِينَ سَنَةٗ قَالَ رَبِّ أَوۡزِعۡنِيٓ أَنۡ أَشۡكُرَ نِعۡمَتَكَ ٱلَّتِيٓ أَنۡعَمۡتَ عَلَيَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَيَّ وَأَنۡ أَعۡمَلَ صَٰلِحٗا تَرۡضَىٰهُ وَأَصۡلِحۡ لِي فِي ذُرِّيَّتِيٓۖ إِنِّي تُبۡتُ إِلَيۡكَ وَإِنِّي مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ١٥ ﴾ الأحقاف.

واتە: هەتا گەیشتووەتە تەمەنی چل ساڵی (ئەویش نەوەی خستووەتەوە، جا نەوەی بە وەفاو بە ئەمەكو دیندار، خوای گەورە ئەم نزا پیرۆزە دەخاتە سەر زاریو فێری دەکات کە) بڵێت: پەروەردگارا کۆمەکیو یارمەتیم بکە تا بە تەواوی سوپاسگوزاری ئەو نازونیعمەتانە بم کە ڕشتوتە بەسەر خۆمو بەسەر دایكو باوکمدا، یارمەتیم بدە تا ئەو کردەوە چاکانە ئەنجام بدەم کە تۆ پێی ڕازیت، داواکاریشم کە نەوەکانم چاكو چاکەکار بن، خواناسو دیندار بن، لە ڕاستیدا من پەشیمانم لە گوناهانمو لە کەمتەرخەمیم، من بەدڵو بە گیان گەڕاومەتەوە بۆ لای تۆ، من (سوپاس بۆ تۆ) لە ڕیزی ئیمانداراننو موسوڵمانانندام.

ئەمە مانای ئەوەیە کۆتایی هاتووە بە دوو چوارگۆشە لە ژیانی، ئێستەش پێشوازی لە دوو چوارگۆشەکەی تر دەکات، واتە نیوەی تەمەنی ڕۆیشتووە، بۆیە پێویستە بووەستێت، وەستانی بەخۆداچوونەوەو هەڵسەنگاندنی کارەکان، کارەکانی دوو چوارگۆشەکەی پێشوو، پێویستە لەم تەمەنەدا تەوبەو پەشیمانی دەرببڕێت، تەوبەو پەشیمانی نیوەی تەمەن، بەڵێنی لەگەڵ خوای خۆی نوێ بکاتەوەو جارێکی تر دان بەوەدا بنێ کە ئەم لە ڕیزی موسوڵمانانە، ئەو کات بە گوڕو تینێکی نوێوە، بە مەعنەویاتێکی پڕو تێرەوە پێشوازی لە چوارگۆشەی دووەم بکات کە چوارگۆشەی خزمەتکردنی کۆمەڵگەو بەشداربوون لە چاکسازی کۆمەڵگەداو گەشەدان بەو بوارەی کە پسپۆڕە تیایدا، جا ئیتر ئەو بوارە ڕامیارییە، یان ئابوری، یان کۆمەڵایەتی، یان تەندروستی، یان هەر بوارێکی تر.

بۆیە دەبینین زۆرێك لە پێغەمبەران چوارگۆشەی دووەمو تەمەنی چل ساڵیان تێپەڕاندووە ئەوجا خوای گەورە پەیامی بۆ ناردونو هەڵیبژاردون لە نێو مرۆڤەکاندا، لەبەرئەوەی ئەو تەمەنە تەمەنی بەخشینە، تەمەنی پێگەیشتنی هزرو بیرە، تەمەنی گونجاوی گۆڕانکاریو ئاڕاستەکردنی کۆمەڵگەیە.

بیر لەم چوارگۆشانە بکەرەوەو شوێنی خۆت دیاری بکە لە ناویانداو سوربە لەسەر ئەوەی تەمەنت پڕ کارو بە کارو بۆ کار بێت.. تا کارەکانت بێوێنەو بەرهەمدار بێت..

ئالانی

# سوودەکانی سێوی سەوز

پوختەیەك سەبارەت بە سێوی سەوز:
سێو یەکێکە لەو میوە گرنگانەی لە خۆپاراستنو چارەسەردا ڕۆڵێکی کاریگەری هەیە، سێو لە ڕووی تامو چێژەوە دەکرێت بە سێ بەشەوە:
(شیرین- تاڵ- ترش)، لە وتەیەکی باودا هاتووە:
(هەموو بەیانییەك سێوێك بخۆ، هەرگیز پێویستت بە پزیشك نابێت).
تایبەتمەندییەکانی سێوی سەوز:
لەو سیفەتانەی سێوی سەوزی پێ جیادەکرێتەوە، ئەوەیە کە بەخێرایی تێکناچێت، لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانرێت لە شوێنی ساردا بۆ ماوەیەکی زۆر هەڵبگیرێت، بەبێ ئەوەی تێکبچێت.
سوودەگشتییەکانی سێوی سەوز:
١- ددان پاك دەکاتەوەو پووك بەهێز دەکات، بە هۆی ئەو پێکهاتەی لە ناویدایە لە جۆری ترشی ئۆکسالیك.
٢- لەگەڵ شوێنەواری خراپی مادەی کۆلیسترۆڵدا دەجەنگێت، کە لە خوێنبەرەکانی جەستەدا کۆدەبێتەوە.
٣- جەستەی مرۆڤ لە ژەهر ڕزگار دەکات، لەبەرئەوەی سێو تایبەتمەندییەکی هەیە، هێرش دەکاتە سەر ڤایرۆسەکان.
٤- چارەسەری قەبزیو سکچوون دەکات.
٥- کۆکە نەرم دەکاتو دەردانی بەڵغەم ئاسان دەکات.
٦- سێوی سەوز زۆر بەسوودە بۆ هەوکردنە بەهێزەکان، ئەمەش بە هۆی بوونی مادەی بەکتین لەناو توێکڵەکەیدا.
٧- یارمەتی شکاندنو لە ناوبردنی بەردی زراو دەدات.
٨- دەوڵەمەندە بە ترشی بەرگری، دژی وەرەمی شێرپەنجە.
٩- کارکردنی سییەکان بەهێز دەکات، هەروەها ئەگەری تووشبوونیان بە شێرپەنجە کەم دەکاتەوە.
١٠- لە ڕیشاڵی دەوڵەمەند بە بەکتریا پێکهاتووە، کە یارمەتی جوانیو گەشی ڕووخسار دەدات.
پێنج هۆکار بۆ خواردنی سێو ڕۆژانە:
یەکەم: سێو خواردنێکی تەندروستە: خواردنو هەرسکردنی سێو ئاسانەو تامێکی خۆشی هەیە، بە بێئەوەی هیچ جۆرە چەورییەکی تێدا بێت، جگە لەوەش وزەیەکی باشت پێدەبەخشێت.
دووەم: سێو بۆ دڵ: لێکۆڵینەوەکان جەخت دەکەنەوە کە سێو لە ماددەیەك پێکهاتووە کە لەگەڵ لایەنە خراپەکانی جەستەدا دەجەنگێت، وەکو ماددەی کۆلیسترۆڵ کە لە خوێنبەرەکانی جەستەدا کۆدەبێتەوە.
سێیەم: سێو بۆ گەدە: لەبەرئەوەی لە پێنج ڕیشاڵی زۆر پێویست پێکهاتووە، بۆ پاککردنەوەی کۆئەندامی هەرس زۆر بە سوودە.
چوارەم: سێو بۆ سییەکانت: خواردنی سێو ڕۆژانە، کرداری سییەکان بەهێز دەکات، هەروەها ئەگەری تووشبوونی ڕیخۆڵە بە نەخۆشی شێرپەنجە کەم دەکاتەوە.
پێنجەم: سێو بۆ ئێسکەکانت: سێو لە مادەی بۆرۆن پێکهاتووە، کە دەبێتە هۆی بەهێزبوونی ئێسکەکانو کەمکردنەوەی ئەگەری تووشبوون، بە نەرمبوونەوەی ئێسکەکان.
بەکارهێنانی سێو وەکو چارەسەر:
١- بۆ سینە توندبوون: بەکارهێنانی سێوێکی توێکڵدار، کە باش هاڕا بێت. هەموو ڕۆژێك لانی کەم بۆ ماوەی نیو کاتژمێر لەسەر سنگت دایبنێ.
٢- بۆ چارەسەری ڕشانەوە: خواردنەوەی یەك پەرداخ شەربەتی سێو، لەگەڵ کەوچکێك زەیتی زەیتوون پێش نانخواردن.
٣- بۆ پاککردنەوەی زەردی ددان: توێکڵی سێو دەبێتە هۆی پاکبوونەوەی ددانەکانت.
٤- بۆ ڕۆماتیزمو ئاسانکردنی میزو ئازاری جومگە: ١٢٠ گرام لە توێکڵی سێو لەگەڵ یەك لیتر ئاودا بۆ ماوەی پانزە خولەك بکوڵێنە، ڕۆژانە چوار پەرداخی لێ بخۆرەوە.
٥- بۆچارەسەری کۆکە: سێو لەگەڵ شەکرو ڕازیانەدا تێکەڵ دەکرێتو بۆ چارەسەری کۆکە دەخورێت.
٦- بۆ چارەسەری ڕەوانی: تێکەڵەی سێو، لەگەڵ ماست دەبێتە چارەسەرێکی یارمەتیدەر بۆ ڕەوانی.

پەری شێخ کەریم

# ئەگەر هۆکارەکەمان دەزانی ئەم کێشەیە ڕووی نەدەدا!

خێزانی بەختەوەر

به چ زمانێك هاوسەر قسه دەكات؟ به هەمان شێوه ئافرەت به چ زمانێك قسه دەكات؟ چۆن بیروبۆچوونیان دەردەبڕن؟ هەردوولا چۆن ڕووبەڕووی كێشەكان دەبنەوە؟ ئایا جیاوازی هەیه له دەربڕینی خۆشەویستی لای هەردوولا؟ ئایا جیاوازی چییه له نێوانیاندا چ هۆكارێك پێكەوە كۆیان دەكاتەوە؟

ئەم پرسیارانەو چەندەها پرسیاری تر كه وەڵامەكانین شاراوەن بوونەته كێشەی سەرەكی له لای هاوسەران.

لێرەدا به كورتی باس لەو كتێبه دەكەین كه دكتۆر (جون كیری) شارەزا له بواری پەیوەندییه مرۆڤایەتیەكاندا، پەرتووكەكەی بەناوی (الرجال من المريخ، والنساء من الزهرة) ئەم نووسەره لەم پەرتووكەیدا باس لەوە دەكات: كاتێك پیاوان هەموویان یەك بوونیەت بوون نیشتەجێبوون له هەسارەی مەریخ له كاتی هاتۆچۆكردنیان به دەوری هەسارەكانی تردا، جارێك له گەشتەكەیاندا سەردانی هەسارەیەكی دراوسێیان كرد كه تەنها بوونەوەرێكی هاوشێوەی تیادا دەژیا، ئەوانیش ئافرەت بوون هەسارەكەیان به ناوی زوهره بوو، بۆیه وایان لێهات بەردەوام پەیوەندییان بەرەو زیادبوون چوو، گەشتێكی ئاسمانیان له نێوان هەردوو هەسارەكەدا پێكهێنا.

ئەمەش وایكرد هەردوولا به پێكەوە ژیان ڕازی ببن، به شێوەیەكی خۆشبەختانه هەمووان پێكەوە دامەزران، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ سەدەها ساڵ لەمەوپێش، پاشان به هۆی زیادبوونیان ناڕەحەتی جێگەكەیان پاش بڕیاردانو گفتۆكردنیان لەو بارەیەوە بڕیاریان دا كه بگوازنەوە بۆ سەرزەوی كه دەتوانن لەوێ جێگر ببنو تیایدا بڵاوببنەوە. لەم چیرۆكه خەیاڵییەوە كه ئەم زانایه باسی لێوە دەكات ئەوەمان بۆ دەردەكەوێت كه دوو دروستكراوی جیاواز له دوو هەسارەی جیاواز، پاش پێكەوە گونجانیان هاتنه سەرزەوی، زۆرجار هەندێكیان ئەوەنده گونجاون پێكەوە كه دەڵێی له تەنها هەسارەیەكدابوون!!

بەڵام هەندێكی تریان ئەم زانایه وا ڕوونی دەكاتەوە كه پێكەوە نەگونجانیان دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی كه دوو كەسی دروستكراوی جیاواز

لە دوو هەسارەی جیاواز، بێگومان ئائێستا لە یەكتری تێنەگەیشتوون، جیاوازیەكانیان بوونەتە كێشەیەكی سەرەكی ژیانیان!

ئەم چیرۆكە خەیاڵییە، لەگەڵ ئەوەدا وانەیەكی گرنگمان فێردەكات، بەڵام خوای گەورە خاوەنی هەموو دروستكراوێكە ئەو دوو نەفسەی بە شێوەیەكی جیاواز دروستكردوون نەك لە یەك بواردا، بەڵكو لە هەموو بوارێكدا، چ لە فیسیۆلۆجیدا، یا بایەلۆجیدا، یا سایكۆلۆجیدا، هەروەك دەفەرموویت:

﴿وَلَيْسَ الذَّكَرُ كَالْأُنثَىٰ﴾ آل عمران: ٣٦

بۆیە كاتێك هەردوولا ڕووبەڕووی كێشەیەك دەبنەوە، پێویستە بۆ چارەسەركردنو زانینی هۆكارەكە بیر لە جیاوازی دروستكردنی لەشولارو هەڵسوكەوتو وتەكان بكەنەوە، بۆ زیاتر تێگەیشتن، شێوازی ئافرەتو پیاو بهێنە بەرچاوی خۆتو سەرنج بدە هەر لە سەری تا نینۆكی قاچەكانی دەبینیت جیاوازن، پاشان بیربكەوە لە هونەری ئەم دروستكردنە! پاشان دەچینە سەر شێوازی بیروبۆچوونو هەڵسوكەوتو گفتوگۆكردن هەتا دوا سیفەتەكان دەبینین هەموویان جیاوازن، پاشان بیر بكەرەوە لە هونەری ئەم جیاوازیەو بیر بكەوە لە هونەری ئەم ئایەتەی سەرەوە.

سەرەتای وەڵامەمان هیچ دروستكراوێكی خوای پەروەردگار بێسوود نییە، ئەگەر ئەم دوو بوونیەتەی وەك یەك دروست بكردایە بێگومان ژیانی هاوسەرییان لێدروست نەدەبوو، پاشان هەڵەو كەمتەرخەمی لە نێوانیاندا دروست نەدەبوو، هەروەك وتراوە هاوسەران هەتا ڕووبەڕووی كێشەو نارەحەتی نەبن، مانای ژیان نازانن.

بۆیە زۆرێك لە هاوسەران بەلایانەوە سەیرە لەوەی كەجیاوازی لەشولار لە نێوانیاندا هۆكارێك بێت بۆ دروستبوونی كێشە، بەداخەوە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ تێنەگەیشتنو نەزانینی ئەم جیاوازی دروستكردنە، كاری كردووەتە سەر ژیانیان، هەندێ لەو هاوسەرانەی كە داخی دڵی خۆیان دەكەن پاش بەسەربردنی چەند ساڵێك پێكەوە، بەڵام نەیاتوانیوە ژیانیان بەرەو باشتر ببەنو خۆشبەخت بن، بەداخەوە تووشی بێئومێدی بوون كاتێك ڕێنماییان دەكەیت بەمجۆرە وەڵام دەدەنەوە: ئێمە زۆر هەوڵمان داوە ژیانمان بگۆڕین، بەڵام پێكەوە دوو دنیای جیاوازین!) وشەی جیاوازین بابەتێكی سەرەكییە كە لەم ژمارەدا باسی لێوەدەكەین، ڕەنگە ئەو جۆرە كەسانە كە مەرجی چارەسەر نەكردن تێنەگەیشتن لە یەكتری بكەن بە هۆكاری جیاوازی لە قسەو هەڵسوكەوتدا، بەڵام هەروەك دەزانین بوونیەتی ئافرەت بەشێوەیەكە نەرمونیانە خوای گەورە تەرخانی كردووە بۆ بەخێوكردنو بەڕێوەبردنی ماڵو منداڵ، بەڵام بەشێوەیەكی بەهێزو بە تواناتر لە ئافرەت هەتا ئەركی كاركردنو نارەحەتییەكانی هەبێت، ئەمەش وادەكات ئەم جیاوازییە بوونییە نەرمونیانو بەهێز كە پێوانەی یەكترین قسەو هەڵسوكەوتەكان جیاوازبنو زۆرێك لە هاوسەران بە هۆی نەزانینی ئەمە جیاوازییەوە ڕووبەڕووی كێشەو ناكۆكی دەبن، پێویستە لەسەر هەردوولا ئەم جیاوازییە بە شێوەیەكی ئیجابیانە لێك بدەنەوە ئەو كات یارمەتیدەرە بۆ نەمانی دوودڵیو بێزاری.

پاشان هۆكارێكی تر تێنەگەیشتن لە جیاوازیی دروستكردن ئەوەیە زۆرێك لە هاوسەران تووشی ناكۆكی دەبن، بۆ نموونە ئافرەت هەمیشە سەرزەنشتی هاوسەرەكەی دەكات بەوەی كە كەمتەرخەمە لە دەربڕینی هەستو سۆزو خۆشەویستیدا، بەڵام دەگەڕێتەوە بۆ ئەو شێوازی بوونیەتە كە هەیەتی، چونكە وەك ئافرەت توانای دەربڕینیان نییەو لە هەمان كاتدا هاوسەران سەرزەنشتی خێزانەكەیان دەكەن بە كەمتەرخەمی لە كاروبارە فورسەكاندا، ئەمەش بە هەمان شێوە ئەو توانایەی كە لە پیاودا هەیە لە ئافرەتدا نییە، بەڵام هەموو ئەم كێشانە كە تووشی خێزانەكان دەبنەوە هۆكارەكەی جیاوازییە لە بوونیەتدا، بێگومان ئەم جیاوازییە یارمەتیدەرە بۆ یەكتری ئەگەر وەك یەك بوونایە ژیان بەڕێوە نەدەچوو. كۆتا وتەو ئامۆژگاریمان ئایا ئەم جیاوازییە بەشێوەیەكی دروستانە لێكی بدەینەوە، یان بە پێچەوانەوە؟ پاشان چۆن بەكاریبهێنین؟

بێگومان بەشێوەیەكی دروستانە بە مەرجێك ئەم دوو هاوسەرە ڕاستە جیاوازن لە شێوەو قسەو گوفتاردا، بەڵام كۆك و تەبابوون لەسەر چەند بنەمایەكدا جیاوازنین، بەڵكو شێوازەجیاوازەكان بە باشی لێك دەدەنەوە، ئەو خاڵانە جێبەجێ دەكەن كە هەر دوو لا ڕازین لەسەری:

* تێگەیشتن لە یەكتری خاڵێكی سەرەكییە لە نێوان هاوسەراندا، لە ژمارەكانی ڕابردوودا باسمان لێوە كردووە، بێگومان هەموو كێشەو نارەحەتییەك بە تێنەگەیشتن بەرەو زیادبوون، پاشان لە ناوچوونی هەردوولا كۆتایی دێت.

* ڕێزوخۆشەویستی ئەمەش خاڵێكی سەرەكییە هەردوولا ئەو جیاوازییەیان لە دروستكردندا، ئەگەر ئەم دوو هۆكارە جێبەجێ بكەن، هەمیشە ڕێز بۆ جیاوازییەكەیان دادەنێن، دەزانن ئەم جیاوازییە هەنگاوێكە بۆ پتەو بوونی نێوانیان بەردەوام بەرێزو خۆشەویستو زیاتر دەبێت.

باشترین بەڵگەمان بۆ ئەم خاڵە ئەوەیە: دكتۆرەیەك بەناوی (باربرە دی أنجلس) شارەزایە لە بواری چارەسەركردنی كێشە خێزانییەكاندا، كتێبێكی هەیە بە ناوی (اللحظات الحقیقیة) باس لەوە دەكات: هەموو پێشكەوتنێك بە بەرنامە ڕێژیو حەزو خۆشەویستی بۆ كارەكان دەستپێدەكات، بۆ نموونە كاتێك وێنەكێشێك پێش ئەوەی فڵچەكەی هەڵبگرێت بە خۆشی وێنەیەكەوە دەست پێبكات، یا بە هەمانشێوە ئەندازیارێك كاتێك دەیەوێت وێنەی بینایەك بكێشێت، ئەمانە هەموو پەیوەندی بە دوولایەنەوە هەیە، بێگومان ئەو هاوسەرانەی كە دەیانەوێت پێكەوە بژین، ئەگەر بە ڕێزو خۆشەویستی بەرنامەڕێژی نەكەن، بێگومان ئەو بەرنامەڕێژییە بەرەو تیاچوون دەچێت. لە كۆتاییدا هیوادارین هەموو لایەك سەركەوتوو بن.

ن: لادن شریعت زادە
و: بەهرە عەبدوڵڵا تۆفیق

# ماڵی باپیرە

باپیرە گەورە لە پشت پەنجەرە کۆنەکەی ماڵە کۆنەکەوە دانیشتبوو.. خەریکی خوێندنەوەی ڕۆژنامە بوو، جارجاریش سەری لەسەر ڕۆژنامەکە بەرز دەکردەوەو سەیری گۆشەیەکی ماڵەکەی دەکرد.. وەك ئەوەی چاوەڕێی هاتنی کەسێك بێت.

چەند ساڵ لەوەو پێش کاتێك داپیرەو باپیرە، بە تەنها دانیشتبوون، چاوەڕوان بوون.. چونکە هەموو شەوانی هەینییەك، یان پشوویەك چاوەڕوان بوون هەر هیچ نەبێت چوار، یان پێنج منداڵیان لەگەڵ خێزانەکانیانداو منداڵەکانیان بێنە لایان.

باپیرەو داپیرە دوانزە منداڵیان هەبوو، پێنج کوڕوحەوت کچ، سێ کوڕیان لە ئەوروپا بوونو هەر لەوێ ژنیان هێنابوو. بۆیە لەوێ مابوونەوە.. هەرچەند ساڵی جارێك دەهاتنەوە، یەك دوو مانگێك لە لایان دەمانەوە، پاشان دەگەڕانەوە.. هەردەم دایكو باوکیان لە یادداە بوو، پارەو پووڵیشیان بۆ دەناردنەوە.

باپیرە هەر بەو شێوەیەی کە سەیری سووچی پەنجەرە کۆنەکەی دەکرد، خەیاڵی ڕۆیشتبوو.

بیری لەو زستانە دەکردەوە کە هاوسەرەکەی، بەیانیانی هەموو پێنج شەممەیەك.. کورسییەکانی ڕێکدەخست، چەرچەفەکانی دەشۆرد، ماڵی پاك دەکردەوە، کەلوپەلەکانی ڕێکدەخست، سەماوەرە کۆنەکەی دادەگیرساند، قۆرییەکی گەورە چای لێ دەنا، هەر خەریکی هاتوچۆ بوو، حەوشەکەی دەشۆرد، خواردنە بە تامە خۆشەکانی لە چێشتخانە کۆنەکەو لە ناو کورەکەدا لێ دەنا.

کاتێك ئاسمان وردە وردە تاریك دەبوو، دەنگی بانگی ئێوارە بەرز دەبوویەوە.. داپیرە چاویلکە زەڕەبینییەکەی، لە چاوەکانی دادەکەند، دەستنوێژی دەگرت، لەسەر بەرماڵەکە دەستەکانی هەڵدەبڕیو نزای خێری بۆ کوڕو بووکەکانیو کچو زاواکانی دەکرد.. ئەوەندە دڵتەنگ دەبوو، هۆن هۆن فرمێسك بە چاوەکانیدا دەهاتە خوارەوە.. زوو زووش بە لەچکە گوڵ گوڵاوییەکەی چاوەکانی دەسڕی، دڵی ئەو پیرێژنە بۆ کوڕەکانی کە لە فەرەنسادا بوون، زۆر تەنگ دەبوو.

هێشتا نوێژەکەی تەواو نەکردبوو، دەنگی زەنگی دەرگاکە هات، کاتێك سڵاوی دایەوە بە باپیرەی گوت:

بینیت، نەمگوت: هەر دێنەوە.. پەیدا دەبن؟!

بە گورجی دەرگای حەوشەکەی کردەوەو هەزاران هیوا، دنیای بێدەنگی ماڵەکەیانی پڕ کرد.. چونکە هەموو هیوای داپیرەو باپیرە، نەوەکانیان بوون.

ئیدی هەموویان پێکەوە، لەگەڵ باپیرەدا، سەرگەرمی قسەی خۆشبوون.. کاتی نانخواردن هاتو سفرە ڕاخرا، بۆنی خۆشی چێشتی مەنجەڵە مسەکان، ئەو ناوەی گرتبووەوە.

دوای نانخواردن، باپیرە بە دەنگێکی بەرز، دەستی بە گێڕانەوەی یادگارییە خۆشەکانی خۆی دەکرد.. ئەوەندە قسەکانی خۆشبوون، هیچ کەس لە قسەکانی تێر نەدەبوو.

هەموو ئەمانە ساڵانێك لەمەوبەر ڕوویان دابوو.. بەڵام باپیرە بیری لێ دەکردنەوە.. ئەو هەمیشە بە خەیاڵی ئەو ساڵانەوە دەژیا...

کاتێك منداڵ بوو، هەرگیز بیری نەدەکردەوە.. ئەو ڕۆژێك بمرێتو چۆن بڵێم؟!! ئەو لەگەڵ مردن، هاوڕازو هاودەمییەکی نەبوو.

ئەوەندە شیكو لەبارو خۆشخۆر بوو.. زۆر حەزی لە خواردن بوو. ئەوەندەش خۆش خواردنی دەخوارد.. خۆ ئەگەر کەسێك لە لای دابنیشتایەو برسیشی نەبووایە.. یەکسەر ئارەزووی خواردنی دەکرایەوە.

ئێستەش هەمیشە کە ئاوگۆشتمان هەبێت.. خۆنەویستانە باپیرەم بیر دەکەوێتەوە.. چونکە ئەو ئەم چەشنە خواردنانەی زۆر پێخۆشبوو.

کە هاوینانیش دەهات.. دەیانکردە شەڕە ئاوو یەکدییان تەڕ دەکرد. بەیانیانیش باپیرە دەچووە بازاڕ، ئەگەر وەرزی هەنجیر، یان توو بووایە، یەك سەبەتەی گەورەی




دەکرێو بەرەو ماڵ دەگەڕایەوە.. ئیدی هەمووان بە چای بەیانییەوە دەیانخوارد. بۆیە هەمیشە لەگەڵ هەنجیرو تووی سپیدا، یادگاری خۆشم هەیە.. چونکە ڕابردوویەکی خۆشم بیر دەهێنێتەوە.

زستانانیش بۆنی شیری تازەی کولاو.. یەك بە یەکمانی لە خەو هەڵدەساند.. ئای چەندە ڕۆژانێکی خۆشبوون...

ڕۆژەکان، هەفتەکان، مانگەکانو ساڵەکان هەموو تێپەڕین.. تا داپیرە ڕۆیشتو ئیدی بۆ هەمیشە باپیرە بە تەنها مایەوە.. ڕۆژانی تازیەباریو ماتەمینی تەواو بوو.

ئێستە باپیرە لە ماڵە کۆنەکەیدا، تەنهایە. ئەو ماڵە کۆنەی بە هیچ جۆرێك بە جێ ناهێڵێت.. بە پێداگری زۆری منداڵەکانی، مانگی چەند ڕۆژێك دەچێتە لایان.. بەڵام هەر زوو دەگەڕێتەوە.

منداڵەکانی ئەوروپای هەریەکەیان سەرگەرمی کاری خۆیان بوون، ئەوەندە گیرۆدە ببوون، ساڵی جارێکیش نەیاندەتوانی باپیرە ببینن.

چاوەکانی گشت شەوانی هەینیو جەژنو پشوویەك، لە پشت پەنجەرەکەوە، خەم دایدەگرتو لە حەوشە وشکەکە ڕادەما. وەك ئەوەی ئەوان ئەوەیان وەلانابوو کە باپیرە هێشتا زیندوو بێت.

کە داپیرە ڕۆیشت، هەموو ڕۆژە خۆشەکانو شتە خۆشەکانی لەگەڵ خۆیدا برد.. لەگەڵ کۆچکردنی ئەودا، ژیانیش لەو ماڵەدا کۆچی دوایی کرد.. سەرەڕای ئەوەی لەشساغ بوو.. نەخۆش نەبوو.

کاتێك منداڵەکان تەلەفۆنی بۆ دەکەنو پێی دەڵێن: هیچت ناوێت؟

ئەو دەڵێت: نە، من بەس تەنهام.. تەنهای تەنها...

دوای تەلەفۆنەکە بە ئارامی هەڵدەساو بەرەو ڕووی ئاوێنەی سەرتاقەکە دەڕۆیشت.. سەرەتا سەیری خۆی دەکرد.. دواتر سەیری وێنەکانی نزیك ئاوێنەکەی دەکرد.. کە وێنەی کوڕو کچو نەوەکانی بوون.. خۆنەویستانە چاوی بە وێنەی خۆی لە پاڵ داپیرەدا کەوت.. حەپەساو دەستە لەرزیوەکانی لە وێنەکە داو دووبارە سەیری دەکردەوەو لە ژێر لێوەوە بە دەنگێکی خۆش دەیگوت:

داپیرەکەم.. من لە کۆتاییدا، لە غەمی تەنهاییدا دیق دەکەم.

باپیرە پێویستی بە داپیرە بوو، تا لەو تەنهاییە ڕزگاری بکات...

چەند ڕۆژ دواتر ئەگەر بە ماڵە خۆڵاوییەکەی باپیرەدا بتڕوانیایە.. تەنها کارە تەواو نەکراوەکانی باپیرەت پێ دەبینرا.. کە نیوە ناچڵ بوونو بۆ هەمیشە ماڵئاوایی کردبوو.

ژیان فێری کردم: پێویستە مرۆڤ ئاواتەخواز نەبێت بارودۆخو گوزەران چاك بێت، بەڵکو پێویستە سەرەتا ئاواتەخواز بێت کە خودی خۆی چاك بێت.

ژیان فێری کردم: سەرکەوتن بریتییە لە گەشتێك نەك تەنها ئامانج، پێویستە سەرەتا چێژ لەو گەشتە وەربگرین، لە ڕێگەی گەیشتنت بەو شوێنەی کە ئاواتەخوازی پێی بگەیت.

ژیان فێری کردم: بەخت بریتییە لە خاڵی بە یەکگەیشتنی نێوان ئامادەکاری باشو ئەو هەلەی کە گوزەر دەکات بەسەرتدا.

ژیان فێری کردم: پێویستە لەسەرمان کە زۆر سەرنجمان لەسەر ئاراستەی (با) قاڵ نەکەینەوە، بەڵکو پێویستە سەرنجمان لەسەر چۆنیەتی جووڵانەوەی چارۆکەکە قاڵ بکەینەوە.

ژیان فێری کردم: پێشبڕکێکاری لێهاتوو، بەردەوام سەرنجی لەسەر ئامانجەکەیەتیو بەرەو ئامانجەکەی دەڕوانێت، هەرگیز بۆ خوارەوە ناڕوانێت، تا ترسو بیم لە بیرو هۆشیدا بڵاو نەبێتەوە.

ژیان فێری کردم: ئەگەر خاوەنی هیواو ورەبەرزییەکی نایاب بوویت، بۆ هەر گرفتێك چارەسەرێك دەبینیت.

ژیان فێری کردم: بۆئەوەی ڕووناکی چراکەت بەردەوام بێت، پێویستە بەردەوام نەوتی تێ بکەیت.

ژیان فێری کردم: خەڵکانێك بە ئاراستەی کەشتی مەلە دەکەن، خەڵکانێکی دیکەش لە چاوەڕوانی هاتنی کەشتییەکەدا کاتەکانی خۆیان بە فیڕۆ دەدەن.

ژیان فێری کردم: هەمیشە دەستپێکردن، قورسترین بەشی کارە.

ژیان فێری کردم: مرۆڤ کاتێك شکست دەهێنێت کۆتایی نایەت، بەڵکو ئەو کاتەی پاشەکشە دەکات کۆتایی دێت.

ژیان فێری کردم: هیچ شتێك لەم ژیانەدا بە دەست نایەت، بەبێ ورەبەرزیو پەرۆشیو گەرمو گوڕی.

ژیان فێری کردم: سەرنجدان لە شتە ساکارو ئاسانەکان، لای زۆرێك لە خەڵکی بە ئاسانی پشتگوێ دەخرێت، بەڵام هەندێك کەس بەو شتە سادەو ساکارانە دەوڵەمەند دەبن.

ژیان فێری کردم: کارگێڕی پراکتیزەییو سەرکەوتوو، واتە دەرکردنی بڕیار بە خێرایی، کاتێك کەسانێکی شیاوو لێهاتوو دەبینێت، بۆ جێبەجێکردنی ئەو بڕیارانە.

ژیان فێری کردم: بۆئەوەی هانی کەسانی تر بدەین، پێویستە سەرەتا خۆمان هان بدەین.

ژیان فێری کردم: پێویستە مرۆڤ هەرگیز نەڵێت: لە کارەکەمدا چەند دووچاری دەردەسەریو ماندووبوون بووم، بەڵکو پێویستە بڵێ: لە کۆتاییدا چیم بە دەستهێناوە؟

ژیان فێری کردم: ژیان بریتییە لە سەرکەوتنو شکستخواردن، هەروەها لە بەدیهاتنی ئاواتەکانو لە دەستدانی هیواکان.

# بابە گیان بمبەخشە، ئێستا لە خۆشەویستی تێگەیشتم



گوڵان حەمە ئەمین

خۆشەویستی سەرمایەی کۆماڵگایەو هەوێنی پێکەوەژیانە، هەرخۆشەویستییە تۆوی قوربانیدان لە ناخی مرۆڤدا دەچێنێت، هەر لەبەرئەمەشە خۆشەویست دەتوانێت لە پێناو خۆشەویستەکەیدا ئازارو نەهامەتیو سەختییەکانی ژیان بە ئاسانی ببڕێت، خۆشەویستی ڕاستەقینەش بریتییە لە قوربانیدانو هاوکاری، واتە خۆشەویستی کردار نەك، گوفتار، بەڵام سەیر لەوەدایە هەمووان زیاتر چێژ لە وشە ئەفسووناوییەکانی دەربڕینو گوزارشتکردن لە خۆشەویستی دەکەین، بە داخەوە زۆرجار سەرجەم ئەو کارو خزمەتانەی خۆشەویستێك ئەنجامی دەدات کەسی بەرامبەر بەشتێکی لاوەکی دەزانێتو لە قاڵبی خۆشەویستیدا لەبەرچاوی ناگرێت، لە کاتێکدا خۆشەویستی ڕاستەقینە بریتییە لەو خۆشەویستییەی لە کرداردا ڕەنگ بداتەوە، هەروەك چیرۆکی ئەو منداڵەی کە دەڵێت: (من لە تەمەنی منداڵیمدا زۆر هەستم بە نیگەرانی دەکردو ناخۆشترین ڕۆژەسەختەکانی تەمەنم بوو، بە جۆرێك ناهەمواری دەروونیو بێزاری باڵی بە سەر سەرجەم بوارەکانی ژیانمدا کێشابوو، نەمدەتوانی کەسم خۆش بوێت، توانای بەرەنگاربوونەوەی ژیانم نە بوو، هیچ سەرکەوتنێکم بەدەست نەدەهێنا، هەمیشە کەسێکی گۆشە گیربووم، هەستم بە کەمی خۆم دەکرد، تەنها هۆکارێکی هەبوو ئەویش: لە خێزانێکدا چاوم بە ژیان هەڵهێنابوو وشەکانی دەربڕینی هەستو سۆزی خۆشەویستی لەم خێزانەدا نامۆبوون! بە تایبەت باوکم، تامەزرۆی وشەیەکی ئەفسووناوی بووم کە ڕۆژێك بڵێت کچەکەم خۆشم دەوێت! خەونم بە بیستنی ئەم وشانەوە دەبینی، چەندەها شەو بە دەم فرمێسکو هەنسکەوە خەو دەیبردمەوە، زۆر لەوە نیگەران بووم کە باوکم وەك باوکی خەڵك خۆشی ناوێم، هەر لەبەرئەمەش لە ناخمدا چەسپی بوو، کە ئەم پیاوە باوکی ڕاستەقینەی خۆم نییە، هەمیشە بەو ئەندێشەیەوە سەرم دەنایەوە کە کامەیە باوکم؟ کەی ئەو باوکە دەبینم لە ئامێزم دەگرێتو وشەی (خۆشم دەوێیت)ی لێ دەبیستم!

ئیدی هەندێجار بێ ئومێد دەبووم لە بوونی خۆشەویستی باوك لە ژیانمدا، لە نێوەندی گەیشتن بە چێژی ئەو خۆشەویستییەو بەردەوامبوون لەم تەنهایی دەروونو هەستو سۆزە تاساوەدا تەمەنێکی پڕ لە ناسۆرم گوزەراند، بەڵام کەسێکی بێزارو گۆشەگیرو بێ ئومێد، تا ئەو کاتەی نەهامەتییەك دەرگای میهرەبانییەکی لێ کردمەوە، ڕۆژێك نە خۆشکەوتم، دوای سەردانی پزیشكو گەڕانەوەم لە نەخۆشخانە شەو هەمووان خەوتبوون، منیش لە ژێر بەتانییەکەمەوە بیرم لە ئازارە دەروونیو جەستەییەکەم دەکردەوە، خۆم زۆر بە بێناز دەزانی، کاتێکم زانی کەسێك بەتانییەکەی

لەسەر سەرم لاداو بەوپەڕی هەستو سۆزەوە هەواڵی تەندروستی پرسیم، منیش زۆر دڵخۆش بووم وامدەزانی خەو دەبینم کە باوکم هاتووەو خەوی لێ تێکچووە بە هۆی ئازاری منەوە، بەڵێ هەر ئەو باوکەبوو کە من وامدەزانی باوکی ڕاستەقینەی خۆم نییە، بیستنی ئەو هەستەی ناخی باوکم هێندە گەرمو بەتین بوو، وردە وردە چیا بەستووەکەی ناخمی تواندەوەو لێرەوە هەستم کرد کە بەڵێ ئەوە باوکی ڕاستەقینەی خۆمەو زۆریشی خۆشدەوێم، بەڵام ئەم کەسە وافێربووە ناتوانێت بە زوبان گوزارشت لە دەربڕینی ناخی بکات، پاشان زیاتر دڵنیابووم کاتێك لە یەکێك لە شەوەکاندا بەخەبەرهاتمو گوێبیستی نوزەو لالانەوەیەك بووم نەمدەزانی چییەو کێیە؟ کاتێك نزیك بوومەوە لە ژوورەکەی باوکم، سەیرم کرد باوکم لەو نیوە شەوەدا خەو لە چاوانی تۆراوە لە خەمی بەختەوەری مندا خەوی لە بیرچۆتەوەو لەسەر بەرماڵێك ڕووە بێگەردەکەی کردووەتە قیبلەو دەستە پاکەکانی ڕووەو ئاسمان هەڵبڕیووەو زۆر بە کوڵ دەپاڕێتەوەو دەڵێت: خوایە ئەم کچەم زایە مەکە، خوایە ئەم کچەم بەختەوەر بکە، خودایە ئەم کچەم پارێزراو بکە... بەم شێوە بەردەوام دەپاڕایەوە بە جۆرێك کە هەرگیز خۆم بەم شێوە بۆ خۆم نە پاڕاومەتەوە، کاتێك گوێبیستی ئەم پاڕانەوە بە کوڵو دڵسۆزانەیە بووم جگە لەوەی ئەسرین گۆناکانمی داپۆشی هیچم بۆ نەدەوترا، سەرسام بووم بەو خۆشەویستییە بێ وێنەیەی باوکم بەرامبەر بە من هەیەتی، شەرمەزابووم، لەو گومانە خراپانەی لە تەمەنی ڕابردوومدا بەرامبەر بەو هەمبوو، لێرەدا تێگەیشتم هەندێ کەس ناتوانن بە وشەکانیان خۆشەویستیمان بۆ دەربڕن، بەڵام ناخیان پڕیەتی لە خۆشەویستی، ئێستا زۆرجار دەڵێم بابە گیان بمبەخشە ئێستا لە خۆشەویستی تێگەیشتم)!

ئازیزان خۆشەویستی ئەو گەنزە بە نرخەیە کە هەمووان ئاواتە خوازی بە دەست هێنانین، هیچ مرۆڤێك نییە کە حەز بە بوونی خۆشەویستی ڕاستەقینە نەکات، جا ئەو خۆشەویستییە لە لایەن هەرکەسێکەوە بێتو هەر چۆنێك بێت مرۆڤەکان بەردەوام بەدوایدا وێڵن، هەر مرۆڤێکیش هەستی بەوە کرد کە شکستی هێناوە لە خۆشەویستیو بەدەستهێنانی خۆشەویستدا، ئەوا ناتوانێت بەشێوەیەکی ئارامو دڵنیا ژیان بەسەربەرێت، هەروەك زۆر جار دەبینین کەسانێك کە خۆشەویستەکانیان لە دەست دەدەن ژیرییان لە دەست دەدەنو ناتوانن ڕووبەڕووی ئەو هەنگاوە سەختە ببنەوە، لەبەرئەوە سێ خاڵ زۆر گرنگە کە بتوانین سوودی لێ ببینین، تاتووشی شکست نەبینەوە:

١- باهەمیشە یەکەم خۆشەویستمان پەروەردگار بێت، چونکە ئەو هیچ کات لە دەست ناچێت، ئەو هەمیشە خۆشەویستی زیاترە بۆمان.

٢- ئەو ڕاستییە بزانین کە خۆشەویستی مەرج نییە تەنها بە وتە بێت، بەڵکو کەسانێك هەن زۆریان خۆش دەوێین، بەڵام ناتوانن بە وتە دەریببڕن، بەتایبەت سایکۆلۆژیای نێرینە بەو جۆرەیە.

٣- باخۆشەویستەکانمان بە ئەندازەی پێویست خۆش بووێت، نەبادا لە خۆشەویستی ئەواندا بتوێینەوە.

گرنگە ئەوەشمان لە یاد بێت کە کەسانێك هەن تینون بۆ بوونی خۆشەویستی، با ئێمە ئەو کەلێنەیان بۆ پڕ بکەینەوە، چونکە هەر کات مرۆڤ کەلێنی لایەنی سۆزداری نەبوو، زیاتر متمانەی بە خۆی دەبێتو دەتوانێت بە سەر گرفتەکانیدا زاڵبێت، گرنگ بوونی خۆشەویستییە جا دایكو باوك بێت، بۆ ڕۆڵەکانیان، یاخود منداڵ بۆ دایكو باوك، یا هاوسەر، یاخود هاوڕێ، یا مامۆستاو خوێندکار... تابتوانین کەلێنە دەروونییەکان بۆ یەکتر پڕبکەینەوە، ژیانیش ئاوێنەیە، هەر کات ئێمە بووینە سەرچاوەی سۆزو خۆشەویستی، کەسانێکیش دەبنە سەرچاوەی سۆزو خۆشەویستی ئێمە، لە لانکەی خۆشەویستیدا هەمووخەمەکان وەلادەنرێت.

ئا: سازان کاکل

# ئامۆژگارییەکی جوان

دەگێڕنەوە جارێکیان بازرگانێکی گەورە، یەکێك لە کوڕەکانی خۆی بە مەبەستی کڕینی شتومەك دەنێرێت بۆ شارێکی دوور. کاتێك کوڕەکە لەگەڵ بازرگانەکاندا بە ڕێگادا دەڕۆیشت، ڕێوییەکی بینی لە نزیك ڕێگاکە لە برساندا خۆی بە زەویدا دابوو، کوڕەکە لە خۆی پرسی: "ئاخۆ دەبێت ئەم ڕێویە چی بخوات؟ چۆن خۆراکی خۆی پەیدا بکات؟" کاتێك کوڕەکە خۆی بەم بیرانەوە سەرقاڵ کردبوو، شێرێکی لە دوورەوە بینی کە هاتو نێچیرێکی باشی ڕاو کردبوو، لە نزیك ڕێوییە برسییەکە خۆی دا بە زەویداو دەستیکرد بە خواردنی، کوڕەکە ڕاماو سەرنجی لەم دیمەنە دەدا، بینی شێرەکە تێری خواردو پاشماوەی نێچیرەکەی بەجێهێشت، ڕێوییەکەش بەبێ ترس چووە سەر پاشماوەکەو دەستیکرد بە خواردنی، کوڕە بازرگانەکە کە ئەمەی بینی لە دڵی خۆیدا وتی: خۆزگە منیش وەك ئەم ڕێوییە دەبووم، بەبێ ماندوبوون هاتە سەر خوانی ئامادە! کوڕەکە دوای گەڕانەوەی لە گەشتە بازرگانییەکەی، ئەم ڕووداوەی بۆ باوکی گێڕایەوە، کە خۆزگەی بە ڕێوییەك خواستووە. باوکی بەم هەڵوێستەی کوڕەکەی زۆر دڵگران بوو، کەوتە سەرزەنشتکردنیو وتی: کوڕی شیرینم دەبوا ئاواتو خۆزگەت بۆ ئەوە بووایە کە شێر بوویتایە، خۆت خۆراکی خۆت پەیدابکردایە، نەك وەك ڕێوی بیتو چاوت لە پاشماوەی کەسانی دی بێت.

بەشی دووەم و کۆتایی

# دایك..

# گوشراوێك لە تەواوی میهرەبانی

درەخشان بەهادین



**دایك یەكەمین نیگای ژیان:**

منداڵ لە ماوەی سەرەتاترین ڕۆژەكانی ژیانی، ئەزموونی خۆی بە پەیوەندی لەگەڵ شێوەو نیگای دایك دەست پێدەكات.

شێوەو ڕووخساری دایك، یەكەمین وێنەی ژیانی مرۆڤە بە درێژایی تەواوی تەمەنی.

لەم وێنەو نیگایەدا دایك چ پەیامو وێنایەك دەگوازێتەوە، نیگەرانییەكانی خۆی، یان ئومێدو ئەوینو هیواكانی؟

ئەمە یەكەمین ئەزموونە كە منداڵ ئامادە دەكات تا سەرمەشقی مەیدانی ژیانی لەسەر بنەمای ئەو وێناو مانایە بینا بكات.

سەرمەشقییەك، كە پێشبینی جۆری ڕەفتارو شێوازە ئاوێتەكانی بە ئەندازەی پەیوەندی پێیانەوە لە هەلومەرجە جیاوازەكانی ژیان ڕێكدەخاتو دیاری دەكات.

ئەمە وتەی شارەزایانی (ئاكاری سروشتییە) كە بەرهەمی چەندین ساڵ لێكۆڵینەوەیان بووە، كەواتە دایكێكی تا ئەندازەیەك چاك یەكەمین پەیامو وێنای ژیان بە ئەرێنیو شادمانی دەنێرێتو ئاراستە دەكات.

دایك، یەكەمین باسو بابەتی ئەوینە لای منداڵ، دەروونناسانی بواری پەیوەندی بابەتی بڕوایان وایە دایك، یان كەسی جێنشینی ئەو، یەكەمینو تەنها بابەتی ئەوینی كۆرپەن لە سەرەتاترین ڕۆژەكانی تەمەنیدا.

لێكۆڵینەوەی ئەم زانایانە كە لەسەر ئەو منداڵانە ئەنجامدراوە، كە دایكیان نەبووە، نەیانتوانیوە لەگەڵ كەسێكیش هاوشێوەی دایك پەیوەندی بابەتیان هەبێت.

هەر بۆیە لە ڕووی كەسایەتیو تەنانەت چۆنییەتی ڕووبەڕووبوونەوەی ئازارو گرفتەكانیان جیاواز دەبن لەگەڵ ئەو منداڵانەی كە دایكیان هەیە.

منداڵ لە ماوەی ساڵی یەكەمی ژیانی كاتێك بابەتی ئەوین لە هزریدا شێوە دەگرێت، لە سەرەتادا هیچ جۆرە هەستێكی جیابوونەوەو پەیداكردنو بە یەكگەیشتنی بۆ ئەو ئەوینە هەست پێناكات، تەنها توانای وێناكردنی هەستی بە یەكگەیشتنی بۆ ئەوینی خۆی كە دایكە هەیە، بە نزیكیش لە كۆتایی ساڵی یەكەمی تەمەنی هەستی جیابوونەوە لە بابەتی ئەوینی خۆی لا دروست دەبێت، بەمجۆرە باری دڵەڕاوكێ، جیاییو تەنهایی تێدا شێوە دەگرێت، هەر بۆیە لەو ماوەیەدا لەوانەیە زیاتر لە خودی دایك، سۆزو ئەوینەكەی لای منداڵ گرنگ بێتو دەترسێت لەوەی كە ئەو سۆزو خۆشویستنەی دایك لە دەست بدات.

ئەمە ئەو چیرۆكەیە كە بە درێژایی ماوەی ژیانی چەندین جار دووبارە دەبێتەوە، ئەگەر دایك بتوانێت پەیوەندی بابەتی دڵنیاییو سەلامەتی بۆ منداڵ فەراهەم بكات، ئەو كات مرۆڤەكان بە درێژایی ماوەی ژیانیان دەتوانن پەیوەندی سۆزداری خۆیان ڕێكبخەن، بیرۆكە دانەرانی (دەروونناسی خود) لە لێكۆڵینەوەیان دەگەنە ئەو ئەنجامەی كە گۆڕانی لە پەیوەندییەكی بابەتیو خوازراوو بەردەوامو دیاریكراو (بابەتێك كە بەسەختی دەتوانرێت جێگرەوەیەكی بۆ بدۆزینەوەو دەستبخەین)، وەك پەیوەندی نێوان دایكو منداڵ، هاوكات لەگەڵ گۆڕانی توانای ڕووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ مەترسی لە دەستدانی بابەتو سەرچاوەی ئەوین بە دەست دێتو نیشانەی هەنگاوێكی یەك لاكەرەوەیە بۆ گۆڕانی (من).

دایك یەكەمین بابەتی ئەوینو

یەکەمین باسی دڵ پەیوەستبوونی مرۆڤەکانە، ئەوە تەنها سەرچاوەی وزەی دەروون لە سەرەتای ژیاندا. ئەگەر ژینگەی کەسێتیو دەروونی دایك کە ژینگەی گەشەی دەروونی منداڵە، هێورو ئارام بێت، جێگەی دڵخۆشیو ئومێدەواری بێت، تێڕوانینو ڕوانگەی مرۆڤ سەبارەت بە تەواوی باسو بابەتەکانی تری سۆزو ئەوینو دڵ پەیوەست بوون لەوانەشە سۆزو ئەوینی ئیلاهی هەر بەو جۆرو دەقە دەبێت.

لەم دواییانەدا زۆرێك لە دەروونناسانو لێکۆڵەرەوان، کە لە بواری پەیوەندی (مرۆڤو خوای گەورەدا)، کاردەکەن گەیشتونەتە ئەو ئەنجامەی کە چۆنیەتیو جۆری پەیوەندی مرۆڤەکان لەگەڵ خودادا لە ژێر کاریگەریو چۆنیەتی یەکەمین بابەتی پەیوەندیکردنە، کاتێك ئەو پەیوەندییە ئەرێنی بێت، ئەو کات وێنای مرۆڤ بۆ خودا ئەوە دەبێت، کە زاتێکی بە بەزەییو میهرەبانە، زیاتر بەهەشتی خوای گەورە لە بەرچاو دەگرێت، بەڵام ئەگەر پەیوەندییەکی ساردو نەرێنی بێت، وادەکات کە تاك زیاتر سزاو دۆزەخو توڕەیی خوای گەورەی لەبەرچاوبێت، هەمیشە وێنای سزادانو تۆڵەساندنی لەبەرچاوە.

پەرستشی کۆمەڵی یەکەم لە ڕووی ئەوینو پەیوەست بوونەوەیە، بەڵام پەرستشی کۆمەڵی دووەم لە ڕووی ترسانە لە سزای خوای گەورەو سەرەنجامی کارەکانیان.

هەرلەبەر ئەمەیە دایکان دەبێت بزانن کە چ لێپرسراوێتییەکی گەورەیان لە ئەستۆدایە، دایکان دەبێت بەردەوام پاڵپشتو جێی ئومێدو دڵنیایی بن، دایك یەکەمین سەرچاوەی وزەو پێگەی ئەوینی جاویدانە، لەسەر ڕێڕەوی ژیان، بەردەوام پێگەو ڕێو شوێنی جیاوازو جۆراوجۆر بۆ دەربڕینی ئەوینو سۆزو نوێکردنەوەو بەردەوامکردنی موحیببەت هەیە، دایك یەکەمین سەرچاوەی وزەی مرۆڤەکانە، یەکەمین پێگەی ئەوینو سۆزە، جێگەو پێگەی تریش لە ژیاندا بۆ پەیوەستکردنی مرۆڤ بە مەعشوقی ڕاستەقینەو ونبووی مرۆڤەکان هەیە، وەك بەڕێوەبەر، مامۆستا، هاوسەر، پیاوباشانو نێردراوانی خوای گەورە، کە تەواوی ئەوانە ڕێگا نیشاندەرن بۆ مرۆڤو مرۆڤایەتیو دەبێت لەسەر یەك ڕێگاو لە یەك توخمی پاكو ڕەسەن بن.

هەر بەو هۆیەوە پێگەی دایك لە ژیاندا، هەمیشە وزە بەخشەو نابێت هیچ کات سووکایەتی پێ بکرێت، یا بەکەم بزانرێتو بچووك بکرێتەوە، دەگونجێت ئێمە دایکێکمان هەبێت بە ئاکارو ڕەفتاری نەشیاوو نەخوازراو، بەڵام ئەمە هیچ پەیوەندییەکی بە پێگەی دایکبوونی ئەوەوە نییە.

دەبێت بەردەوام ئەو پێگەیە بۆ سەلامەتی دەروونی خۆمان هەروا بەڕێزو پیرۆز بزانین، بە پێچەوانەی ئەمەوە لەگەڵ تەواوی ڕێوشوێنەکانی تری میهرو ئەوین دووچاری گرفت دەبین، بۆ ڕێکخستنی پەیوەندیمان لەگەڵ تەواوی پێگەکانی تری ئەوینو موحیببەت دەبێت پەیوەندی خۆمان لەگەڵ دایكو بە تایبەتی تر لەگەڵ گرنگیو پیرۆزی پلەو پایەی دایك، لەسەر یاساو ڕێساو دەروونی خۆمان ڕێکبخەین، هەر بۆیە دایك چ لە ژیاندا بێت یا کۆچی دوایی کردبێت، سەرچاوەی وزەیەو ئومێدبەخشە بۆ ئێمەو تەواوی قۆناغو چالاکییەکانی تری ژیان.

هەر بۆیە نیشانەکانی دایکێکی تا ئەندازەیەك باش ئەمانەیە:

١- قبوڵکردنی ئەرێنیو بێ مەرجی منداڵیانو ئەوینو خۆشەویستی بێ بەرامبەرو بێ کۆتوبەند بۆ منداڵ، دایك دەبێت سەرچاوەو مەڵبەندی میهرو سۆز بێت نەك هێز، چونکە ئەگەر ئەو بیەوێت پێکەوەو لە یەك کاتدا بنکەی هێزو سۆزیش بێت، خودی خۆیو منداڵیش دووچاری نەگونجانو جیاوازی دەکاتو لە لایەکی تریشەوە جێگەو پلەو پایەی باوك لە خێزاندا دەخاتە مەترسییەوە.

٢- دیاریکردنی کاتی نیازو تواناکانی منداڵ، کات ناسینو دیاریکردن، دەبێتە هۆی ئەوەی دایك لەگەڵ گۆڕانو گەورەبوونی منداڵ بگۆڕێتو خۆی بگونجێنێت، ئاستی چاوەڕوانییەکانی لە منداڵ، لە قۆناغی نەوجەوانیدا لەگەڵ قۆناغی منداڵیدا جیاواز دەبێت. بە داخەوە هەندێك لە دایکان لە قۆناغی نەوجەوانی منداڵەکانیان، بیریان دێتەوە کە ئەوان دایکن!

٣-ڕازیکردنو خۆشحاڵکردنی بە وەختو بە ئەندازەی نیازی منداڵ.

٤- ئارامبوونو هێمنی لە کاتی هەڵسوکەوتکردنی لەگەڵ منداڵداو قبوڵکردنی لێپرسراوێتی دایکایەتی.

٥- ڕاستی لە ڕەفتارو ناردنی پەیامی ئەرێنی بۆ منداڵ، بۆ نموونە ڕاستی بە مانای نیشاندانی ڕووخساری بێ ئارایشو ڕاستەقینەی دایك، لە یەکەم ساتو دیداری لەگەڵ کۆرپەدا. بهێڵێت منداڵ بە بۆنو ڕووالەتی ئاسایی ئەو ئاشنا بێت.

٦- هەبوونی زانیاری پێویست دەربارەی چۆنیەتی هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ منداڵو شێوەی پەروەردەکردن.

٧- هەبوونی شارەزاییو ئەزموونی پێویستی ئەرکی دایکایەتی.

٨- نەبوونی تایبەتمەندییە نەخوازراوەکانی کەسێتی، یا بارێکی تایبەتی دەروونی، وەك: دڵەڕاوکێ، خەمۆکی، خودپەسەندی، لاساییکردنەوەو هەروەها خۆگونجاندنو هاوشێوەبوونی نەگۆڕو بەردەوام لەگەڵ هاوڕەگەزی خۆی.

٩- هەبوونی تایبەتمەندییە ئەرێنیو خوازراوەکانی کەسێتیو هاوتەریبو گونجاو لەگەڵ دایك بوونیدا، وەك هەڵکردنو ڕاهاتن لەگەڵ بارودۆخە جیاوازەکان، لە بواری خۆیدا بەهەرەدارو داهێنەر بێت، هەبوونی تایبەتمەندییە ئەرێنییەکانی تری ژنو هەروەها بە ئەزموونیو هەبوونی توانای هاوڕێیەتیو دۆستبوون.

١٠- هەبوونی گیانی هاندەرانەی تایبەتو شادی بەخش، چونکە دەبێت دایکان بزانن ئەوان یەکێکن لە گرنگترین سەرچاوەکانی هێمنیو ئارامیو هەستی باوەڕ بە خۆبوونی منداڵەکانیان، مەبەست لە بوونی گیانێکی تایبەت ئەوەیە کە دایکان لە هەندێ کاتو بەشێکی تەمەنیان گیرۆدەو گرفتاری گرفتو خەمی خودی خۆیان دەبن، وەك ئەوەی دوای بە دایکبوونیان لەگەڵ منداڵەکانیان دەکەونە باری ڕکابەرییەوە.

ئەم ڕەفتارانەش دەبێتە هۆی دوورکەوتنەوەی ونبوونی کەسایەتییان لە ناخو هزری منداڵەکانیانو بیرو دەروونی ئەوان لە پرشنگو گەرمایی سۆزی دایکیان بێبەش دەکات، نەبوونی ئەو دووانەش دەبێتە هۆی ساردو سڕبوونی کەسایەتی منداڵ.

لە کۆتاییدا با دایکانی خۆمانو منداڵەکانیشمان بە پیرۆز بزانینو پەرۆش بین بۆیان، چونکە وەك وتراوە: ئەوەی کورێك گەورە دەکات، تەنها پیاوێك پێدەگەیەنێت، بەڵام ئەوەی کچێك پەروەردە دەکات، کۆمەڵگایەك لەسەر دەستی پەروەردە دەبێت.






# بوخچەی ڕەش

و: فیردەوس حەسەن

لە خێزانێکی تا ڕادەیەك خۆشبەخت هاتوومەتە دنیاوەو گەورەبووم، من کچی گەورەی خێزانەکەمانم، باوکم بازرگان بوو، ساڵی چەند جارێك سەفەری دەکرد بۆ وڵاتانی دنیا، دایکم سەبارەت بە پەروەردەکردنی منو خوشكو براکەم زۆر هەستیار بوو، ئێمە تەنها ئەوەندە مۆڵەتمان هەبوو کە بە پاس، یان لەگەڵ دایکم خۆیدا بچینە قوتابخانەو بگەڕێینەوە، ئەو هەمیشە دەیگوت:

- مافی ئەوەتان نییە لەگەڵ هیچ کەس ببنە هاوڕێ، بچنە ماڵی هیچ کەسو هیچ کەسێکیش بهێننە ئێرە، لە بەرامبەر ئەمەدا هەرچییەکمان بویستایە، بۆی فەراهەم دەکردین، جۆرەها کتێبو کەلوپەلی یاریو خواردنی خۆش، هەندێجاریش دەیبردین بۆ پارکو سینەما، ئێمە کەمتر هەستمان بە سێبەری باوکمان دەکرد لەسەر سەرمان، ئەو یان لە سەفەر بوو، یان ئەگەر لە ماڵەوەش بووایە ئەوەندە سەرقاڵی حیسابو کیتاب بوو، بیری لە ئێمە نەدەکردەوە، چەندە حەزم دەکرد لەو ساڵانەدا لەگەڵ باوکم قسە بکەمو ڕاوێژو دەردەدڵ بکەم، بەڵام ئەو هەموو بەرپرسیارییەکی خستبووە سەرشانی دایکم، بە دڵنیاییەوە دایکم هەر بڕیارێکی بدایە بێ چۆنو بۆچی ڕازی دەبوو.

لە تەمەنی بیستو دوو ساڵیدا یەکەم خوازبێنیکار لە دەرگای ماڵمانی دا، من تازە بڕوانامەی بەکالۆریۆسم وەرگرتبوو، (شاهین)یش بڕوانامەی بەکالۆریۆسی هەبوو، کارمەندی فەرمانگەیەکی حکومی بوو، ئەو پێنج ساڵ لە من گەورەتر بوو، دایکم کەمی مووچەکەی ئەوی کردە بیانوو، وتی:

من کچ نادەمە کارمەندێك، کچی من لە نازو خۆشگوزەرانیدا گەورە بووەو ناتوانێت بە موچەیەکی کەمی کارمەندی گوزەران بکات.

ئەو خۆی دەیبڕی و دەی دووری، بێئەوەی ڕای من وەرگرێت، لانی کەم پێنج داخوازیکاری تری بەم شێوەیە ڕەفز کرد، جارێکیان کە پێم گوت بۆ وا دەکەی؟ وتی: مەترسە تۆ هێشتا زۆر گەنجیت، دەیان کەسی تر دێنە داوات، دەبێت لە نێوانیاندا باشترینیان هەڵبژێریت، ئەو پێوەرەکانی منی لا پەسەند نەبوو، دەیگوت: پارەوسامان لە هەموو شتێك گرنگترە، ئەگەر من سی ساڵە بە دیار باوکتەوە دانیشتووم، لەبەرئەوەیە کە پارەی هەیە، هیچ کات نەیهێشتووە لە ڕووی ماددییەوە نەبوون بم.

دنیای دایکم لەگەڵ من زەوی تا ئاسمان جیاوازبوو، هەموو شتێکی ئەو لە پارەدا خۆی دەبینییەوە، لە کاتێکدا کە من باش دەمزانی لە نەبوونی خۆشەویستی تەواودا خەفەت دەخواتو باوکم لە ڕووی سۆزدارییەوە ئەویشی پشتگوێ خستبوو، ئەوان وەکوو دوو هاوڕێی ئاسایی نەك گیانی بە گیانی لە ژێر سەقفێکدا ژیانیان دەبردەسەرو ڕێزیان لە یەکتر دەگرت. کاتێك تەمەنم گەیشتە بیستو هەشت ساڵ، تووشی دڵە خورپە بووبووم، هەرچەند هەمووان دڵیان دەدامەوەو دەیانگوت: (تینا گیان تەمەنی هاوسەرگیری بەرز بووەتەوە، لەبەرئەوە خەم مەخۆ! لەبەرئەوەی لە خێزانێکی دەوڵەمەندیشی باشترین داخوازیکارت دەبێت).

تا ئەوەی کە بە فەرزاد ئاشنا بووم، ئەو لە دووکانی فەرش فرۆشی باوکیدا کاری دەکرد، ڕۆژێکیان بۆ فەرش کڕین لەگەڵ دایکمدا ڕۆشتبووینە دوکانەکەیان، ئەوم بینی، چەند جارێك سەیری یەکتریمان کردو کاتێك کە ویستمان بڕۆین کارتی دووکانی دا بە دایکمو وتی: (ئەو فەرشەی کە ئێوە دەتانەوێت لە گەنجینە هەمانە، چەند ڕۆژێکی تر تەلەفۆن بکەنو وەرن بیبەن).

چوار ڕۆژ دواتر لەگەڵ دایکم ڕۆیشتم بۆ دوکانی باوکی فەرزاد ئەمجارە نیگاکانمان ڕەنگی ئاشنایی پێوە دیاربوو، فەرزاد گەنجێکی ژیرو هەوڵدەربوو، ئەو کوڕی گەورەی خێزانەکەیان بوو، تەمەنی سیوچوار ساڵ بوو، کاتێك دایکم زانی کە فەرزاد دەیەوێت بێتە خوازبێنیم بە ڕوو گرژییەوە وتی: ئەو هەموو کاتە ئاراممان گرتووە، ئەو هەموو داخوازیکارە جۆراوجۆرەمان ڕەفز کردووە کە شاگردێکی فەرش فرۆش ببێتە زاوامان؟

ئەو کوڕی خاوەن دوکانەکەیە، سبەی ڕۆژ هەموو سامانەکەی بە ئەوو تاقە خوشکەکەی دەگات...

- باشە هەرکەس پرسی هاوسەرەکەی تینا چ کارەیە چی پێ بڵێین؟ ڕاستییەکەی ئەوەیە کە ئەو بەردەستو شاگردی باوکییەتی.

کاتێك بۆچوونەکەی دایکمم بە فەرزاد گوت بیری کردەوەو وتی: (لەگەڵ باوکم

قسە دەکەمو ڕێگا چارەیەك دەدۆزمەوە، دوای چەند ڕۆژێك فەرزاد بە خۆشحاڵییەوە هەواڵی هێناو وتی: (باوکم ڕازی بووە کە نیوەی دوکانەکەو سەروەتو سامانەکەی بکات بە ناوی منەوە، ئەو کات من دەبمە شەریکی ئەو نەك شاگرد).

کاتێك بابەتەکەم بۆ دایکم باسکرد خۆشحاڵ بوو، ڕێگای دا ئەوان بێنە خوازبێنیم. دوای دوو هەفتە فەرزادو خێزانەکەی هاتن بۆ ماڵمان، بەڵام خوشکە نەهاتنیە، چونکە دوای ڕۆیشتنی ئەوان دایکمو باوکم دەستیان کرد بە هەراو هوریاو بیانوویان ئەمەبوو: (ئەم بنەماڵەیە لە ڕووی فەرهەنگییەوە لەگەڵ ئێمە ناگونجێن، ئەوان خێزانێکی مەزهەبینو ئەگەر ببیتە بووکیان ناچاری پەچە بدەی بە ڕووخسارتدا، لە میوانییەکاندا باش خۆت داپۆشیت).

لە کاتێکدا کە ڕووم گرژ کردبوو وتم: ئەگەر بەو شێوەیە بن کە ئێوە دەڵێن ئەوان ئەوەندە پەچەیان بەلاوە گرنگ بێت هەرگیز نەدەهاتنە خوازبێنیم، مەگەر فەرزادو باوکی لە دوکان منیان بە مانتۆوە نەدیوە؟

- دیویانە، بەڵام ئەوان ڕووی ڕاستەقینەی خۆیان ئێستا پیشان نادەن، کاتێك کە بوویتە بووکیان ئەو کاتە ئەوەندە مەرجت بۆ دادەنێنو خوێنت دەکەنە کاسەوە.

بە گریانەوە وتم: ئەگەر وابوایە فەرزاد پێشتر ئەمەی پێ دەوتم.

- سەیرکە تینا، ساویلکە مەبە، چاوەڕێ دەکەیت فەرزاد بە پێچەوانەی دایكو باوکییەوە قسەت لەگەڵدا بکات؟ کێشمەکێشمی منو دایکم چەند مانگێك بەردەوام بوو، فەرزاد ئامادەبوو هەموو کارێك بکات تا خەیاڵی دایکم ئاسوودە بکات، بەڵام دایکم یەك هەنگاویش نەدەهاتە پێشەوە، من هەرگیز ڕێگا نادەم ببیتە هاوسەری ئەم کوڕە، شکاتی دایکم بردە لای باوکم، بەڵام ئەو خۆی لەو بەرپرسیاریەتییە بەدوور گرتو وتی: تۆ دەزانی کاروباری دەرەوە پەیوەستە بە منەوەو کاروباری ماڵەوەو منداڵەکانیش پەیوەستە بە دایکتەوە، ئێمە ساڵانێك لەمەوپێش بڕیارمان داوە کە لە کاروباری یەکتریدا خۆمان هەڵنەقورتێنین.

لەوەی کە ئەوەندە لاواز خۆی نیشان دەدا لە بەرامبەر دایکم، تووڕە بوومو بە فەرزادم گوت: وادیارە چارەنووسی منو تۆ ئەوەیە کە بە یەك نەگەین.

سەرەتا بیرم کردەوە لە دادگا مۆڵەتی هاوسەرگیری وەربگرم، بەڵام ئەگەر ئەم کارە ئەنجام بدەمو دادگاش ماف بە من بدات، ئەوا نامەوێت بۆ هەمیشە خێزانەکەم لە دەست بدەم، من دایکم باش دەناسم ئەگەر کاری وا بکەم بۆ هەمیشە دەرم دەکات.

فەرزادی بێچارە بۆ ماوەیەکی تریش هەوڵی دا، بەڵام کە زانی بێ سوودە ڕۆیشت بەدوای چارەنووسیداو کچێکی تری هەڵبژارد، خۆش لەوەدا بوو ئەو کچەش وەکو من مانتۆی لەبەر دەکرد، بیستبووم کە ژیانێکی خۆشیان هەیەو خێزانی فەرزاد دەستیان نەدەخستە ژیانیانەوە.

- بینیت دایە بیرکردنەوەت هەڵە بوو.

- نا تیناگیان تۆ عەقڵت بەو شتانە ناشکێت، ئەگەر لەو کچە بپرسیو لێی نزیك ببیتەوە، دەبینی کە دڵی خوێناوییە، بەڵام چاوەڕێی ئەوەش مەکە کە کێشەی خۆیت بۆ باس بکات.

هەرچی بوو من تەمەنم گەشتبووە نزیکەی سیو یەك ساڵو زۆر نیگەرانی ئایندەم بووم، هەوڵم دەدا خۆم سەرقاڵ بکەم بە هەندێ کاروباری جۆراو جۆرو سەیر کردنی فلیمو کتێب خوێندنەوەوە، بەڵام بۆ ساتێکیش لە بیرکردنەوە لەو ئایندە نادیارەی کە هەمبوو نەدەوەستام.

هەر لەم کاتەدا بوو باوکم شکستی هێناو کاروبارەکانی ڕەونەقی نەما، هەر لەبەر ئەوەش ئەو تاڵو تەرا داخوازیکارەی کە هەمبوو ئەویش نەماو دایکم هەر سووربوو لەسەر قسەی خۆیو دەیگوت: نیگەران مەبە تینا دڵنیابە کەسێکی گونجاو پەیدا دەبێت کە بێتە خوازبێنیت...

- ئەو کاتانەی کە باوکم جانتاکانی پڕ بوون لە پارە هەموو خوازبێنیکارەکانت ڕەفز کرد، ئێستا کە ئیفلاسمان کردووە وا بیر دەکەیتەوە کە شازادەیەکی ئەورووپی بێتە خوازبێنیم؟! دەزانم بۆ دڵخۆشکردنی من ئەو قسانە دەکەیت.

هەفتەکانو مانگەکان خێرا خێرا تێپەڕ دەبوونو تا چاوم دەکردەوە یەك ساڵ دەچووە سەر تەمەنم، کاتێك کە تەمەنم گەیشتە سیو شەش سیوحەوت ساڵ، کەسانێك دەهاتنە خوازبێنیم کە سەرسوڕهێنەر بوون، یەکێك لەوان پیاوێك بوو کە تەمەنی چلو نۆ ساڵ بوو، هێشتا هاوسەرگیری نەکردبوو، ڕووخساری چرچو لۆچو قژە ماشو برنجییەکەی تەمەنی ئەوی زیاتر لەوە نیشان دەدا کە هەبوو، دەیگوت: ئەوەندە ئەمسەرو ئەوسەرم کردو بە دوای پارەدا ڕۆیشتم، کاتێك بینیم تەمەنم بۆ هاوسەرگیری گەورە بووە، ئەویش هەر خوشکەی بە ڕابردوو دەخواست، کەسێکی باشو بە ئەزموون بوو، بە خێزانەکەمم گوت: من ئامادەم ببمە هاوسەری ئەو پیاوە.

دایکم گاڵتەی پێکردمو وتی: دەتەوێت شو بە پیرەمێردێك بکەیت؟ نابینی قژەکانی سپی بووە؟ منداڵەکانتان کە گەیشتنە دەو دوانزە ساڵ ئەو ئیتر دەمرێت.

نازانم بۆ لە بەرامبەر دایکمدا بێدەنگ بووم، یانی ڕاستییەکەی چارەیەکی ترم نەبوو، چونکە باوکمی لە پشت بوو، ئەو بە پشتیوانی باوکم بەمجۆرە حوکمی دەکردین.

لە دوای ئەوە ئیتر یەك داخوازیکاریشم نەبوو، زۆرنیگەران، نیشانەکانی خەمۆکیشم پێوە دەبینرێت،هەرکەس باسی هاوسەرگیری دەکات ڕووگرژ دەکەمو بابەتەکە بە لایەکی تردا دەبەم، دایکم خەریکە لەوە تێگەیشتووە کە چەند هەڵەی کردووە، هەوڵ دەدات دڵخۆشیم بداتەوە، بەڵام چ سودێکی هەیە؟ ئایا بە خوشکە خواستنو دڵدانەوە هیچ لە مەسەلە دەگۆڕێت؟ ئایا ئەو تەمەنە ڕۆیشتووە دەگەڕێتەوە؟ نازانم چی بکەم؟

یەکێك لە هاوڕێکانم دەیگوت: ئەگەر بتوانیت شوو بکەیت بە پیاوێك کە ژنەکەی مردبێت ئەوەش هەر باشە. بەڵام بیر کردنەوە لە شتێکی وەهاش ئازارم دەدات.

**بیروڕای دەروونناسان لەسەر ئەم بابەتە:**

سەختگیرییە بێ بنەماکانی هەندێ لە خێزانەکان لەسەر مەسەلەی هاوسەرگیری هەندێجار لاوەکان لە گەیشتن بەم بابەتە گرنگە دووردەخاتەوە، یان بێبەش دەکات، تەنها بیرکردنەوە لە سەروەتو سامان هۆکارێکە کە گەنجەکان لە پرۆسەی هاوسەرگیری دوور دەخاتەوە، لەو ڕووداوەی سەرەوە بۆمان دەردەکەوێت دایکی تینا بە هۆی لە خۆباییبوونو ئەوجۆرە ڕەفتارە زیاد لە پێویستانەی بووە هۆی ئەوەی کە کچەکەی هاوسەرگیری نەکاتو هەروەها تیناش ئیرادەی تەواوی بۆ بەرگریکردن لە مافی خۆی لە بەرامبەر دایکیدا نەبوو. کەواتە تۆی بەڕێزو خانەوادە ئەزیزەکان با وردترو ژیرانەتر بڕیار لە چارەنووسی نەوەکانیان بدەن، تا تینا پەندێك بێت بۆ لاوەکانی دوای خۆیو ئەزموونو ژیانی ئەو دووبارە نەکەنەوە.

سەرچاوە/ روزهایی زندگی

دوای تەڵاق



# تێڕوانینت بۆ ئەو هاوسەرانەی لە یەکدی جیابوونەتەوە!

**گۆشـەی دوای تەڵاق گۆشـەیەکی نوێی گۆڤاری بڕیارە، گومانی تێدا نییە کە هیچ کۆمەڵگەیەك لەسـەر زەوی لەم دیاردەیە خاڵـی نییە، هەربۆیە ئێمـەش حەزمان کـرد وەکو چینو توێژێکی کۆمەڵگە گۆشەیەکی تایبەت سەبارەت بەو بەڕێزانە بکەینەوە کە ئێسـتا دوور لە هاوسـەرانیان ژیان دەگوزەرێنـن.. بڕیار لەم گۆشـەیەدا سەرەتا باس لە ڕاستکردنەوەی دیدو تێڕوانینمـان بـۆ ئەو هاوسـەرانەی لە یەکـدی جیابوونەتـەوە دەکاتو پاشـان هۆکارەکانـی کۆنترۆڵکردنو کەمکردنـەوەی ئـەم دیاردەیـەو لە درێژەی گۆشەکەشـدا باس لە ژیانی کۆمەڵێك لەو هاوسـەرانە دەکات کە چـۆن توانیویانە لە ئەزمـوونی نوێی ژیانیـان سـەرکەوتووبنو ببوونەتـە پێشەنگ بۆ ئەو خوشكو برایانەی کە لە پرۆسـەی یەکەمی هاوسەرگیریدا سەرکەوتوو نەبوون.**

### وشـەی تـەڵاقو تێڕوانینـت بـۆ ئەو هاوسـەرانەی لە یەکدی جیابوونەتەوە!

تەڵاق ئەوەندە وشەیەکی باوە کە هیچ کات پێویست بە ناساندن ناکات، هەر کات گوێبیستـی ئەم وشـەیە دەبین هەمووان دەزانین واتە هەڵوەشـاندنەوەو تێکدانی خانـەو لانەی هاوسـەران، واتـە گۆڕینی وشەی پاکی خۆشەویسـتی بە ڕقو کین، واتە هەڵوەشاندنەوەی کۆشکێکی خێزانی، جیابوونـەوەی ئـەو دوو هاوسـەرەی کە هەموو ئاواتو خـەونو هیوایان ئەوەبوو لـە ژێـر سـاباتی ماڵێکـی خنجیلانەدا کۆببنـەوە، واتـە جوودابوونـەوەی ئەو دوو کەسـەی کە ئامـادە بوون لە پێناوی بـە یەکگەیشـتندا هـەر قوربانییـەك پێویسـت بێت پێشکەشی بکەن، تەنانەت شـکاندنی دڵـی ئـەو دوو مرۆڤـەی کە نزیکتریـنو ئەزیزترینو بە وەفاترینیان بوون کە دایـكو باوکیانە، لە پێناوی بە یەکگەیشـتندا دڵی ئەوانیش دەڕەنجێنن، هەر لـە پێنـاوی بـە یەکگەیشـتندایە کاتێك دایکی کچە دەڵێت: دەبێت مارەیی کچەکەم ٥٠٠ لیرەی ڕەشادی بێت، کوڕەکە بێ سـێ و دوو دەڵێت بـە چاوان، ئەگەر یەك لە هاوڕێکانـی ئامۆژگاری بکردایەو بیگوتایە مەچـۆرە ژێر باری ئەو هەموو مارەییـەوە، لە وەڵامدا دەیگـوت: ئەگەر داوای هەمـوو دنیـام لـێ بکرێـت بـۆ گەیشـتن بە خۆشەویستەکەم بێ دوودڵی پێشکەشـی دەکـەم، خۆئەگـەر کوڕەکـە کەم دەرامەت بێت کچە ئامادەیە لەسـەر بەردێـكو لەبەرخۆرەتـاو بـە مارەیـی تەنهـا ئەڵقەیەك لەگەڵ هاوسـەرەکەیدا بژێ! ئەم هاوسـەرانەی ئێستا بڕیاری لە یەکجیابوونەوەیـان داوە هەر ئەوانەن کە دوێنێ مانگی چواردەی دەروەشـاوەیان بە ڕووخسارو چاوی گەشـی هاوسەرەکەیان لێك دەدایەوە!

بـە هەرحـاڵ ئـەوەی لێـرەدا ئێمە مەبەسـتمانە تیشـکی بخەینـە سـەر، باسـکردن نییە لە ڕابردووی خێزانەکانو

کولانەوەی برینەکانو بریندارکردنی هەستو سۆزی هەموو ئەو خوشکو برا ئازیزانەی بڕیاری جیابوونەوەیان داوەو ئێستا لە دووری یەکدی ژیان دەگوزەرێنن، بەڵکو قسە کردنە لەسەر یەکێک لەو نەریتە خراپانەی کە لە نێو کۆمەڵگەی کوردیدا باوە، ئەویش ڕوانینە بۆ هاوسەرانی جیابووەوە، چ پیاو بن، یان ئافرەت!

هەروەکو لە سەرەتادا باسمان کرد ئەم دوو کەسە هەموو ساتێک خەونیان بەو ڕۆژەوە دەبینی کە بەیەکتر شاد بن، بەڵام دوای بەیەکگەیشتنو بردنە سەری چەند مانگێک، یان چەند ساڵێک لە ژیانی هاوسەری، ئیدی پێکەوە هەڵناکەنو دوای ململانێیەکی زۆر بڕیاری جیابوونەوە دەدەن!

ئازیزانم ئێستاو لەم بابەتەدا دەمانەوێت قسە لەسەر ئەم گرفتە بکەین، هەروەکو ئاماژەمان پێدا جیابوونەوە لانی کەم واتە هەڵوەشاندنەوەی خێزانەکان، بێبەشکردنی منداڵەکان لە سۆزی دایەو میهری بابە، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە کۆمەڵگە بە چاوێکی شکستخواردوو، یان خوانەخواستە بە چاوێکی کەم، بۆ ئەم دوو هاوسەرە بڕوانێت، لەبەرئەوەی نەیانتوانیوە درێژە بە ژیانی خێزانییان بدەن، کەواتە با لێرەدا قسەو تێڕوانینمان بۆ ڕاستکردنەوەی ئەم نەریتە بێت، حەزدەکەم بە پرسیارێک بچمە نێو بابەتەکەوە:

ئایا کەسانێک کە نەیانتوانیوە درێژە بە ژیانی هاوسەری بدەن، بە شکستخواردوو، یان خراپ لە قەڵەم دەدرێن؟

لە وەڵامدا دەڵێین: بێگومانو زۆر بە دڵنیاییەوە نەخێر، بۆچی دەبێت ئەو کەسەی نەیتوانی لەگەڵ هاوسەرەکەی درێژە بە ژیان بدات بە چاوێکی کەم سەیر بکرێت؟ ڕەنگە کەسانێک بڵێن پێویستە لەسەر هەموو خراپەو نارەحەتییەکانی هاوسەرەکەی ئارام بگرێت، لە پێناوی منداڵەکانیدا! منیش سەد لە سەد لەگەڵ بۆچوونەکەتدام، بەڵام ئەی ئەگەر چیدی نەیتوانی لەسەر خراپەکارییەکانی هاوسەرەکەی ئارام بگرێت، ئەو کاتە چی؟

ئەگەر هەڵەی هاوسەرەکەی ئەوەندە گەورەبوو، کە قابیلی قبوڵ نەبوو، ئەو کاتە چی؟

ئایا دەبێت کە بڕیاری جیابوونەوەی دا، ئیدی بە هاوڵاتی پلە دوو سەیر بکرێت؟

لە وەڵامدا دەڵێین: ڕاستە جیابوونەوە تاڵە، بەڵام جاری وا هەیە مانەوەو درێژە دان بە ژیانی هاوسەری تاڵترە! هەر بۆیە دەڵێم ئەو کەسانەی کە دواجار لە هەموو ڕێگەچارەکاندا دەگەنە بنبەست، ئەوا بە دڵنیاییەوە تەڵاق باشترە لە ژیان لە نێو ئاگردا، یان کورد وتەنی لە نێو خانەیەکی پڕ لە جەنگدا!

ئەو دووهاوسەرەی لە یەکدی جیابوونەتەوە بەڵگە نییە لەسەر خراپییان، ئەوان دوو کەسن، یان بڵێین دوو تەبیعەتن کە نەیانتوانیوە پێکەوە هەڵ بکەن، ڕەنگە ژیانیان لەگەڵ هاوسەری دووەمدا زۆر خۆشو ئاسوودە بێت!

لە ژیانی پێشەواو ئاودارانو چاکەکاراندا ئەم ڕووداوە خاڵی نییە، باشترین بەڵگە بۆ پشتڕاستکردنەوەی وتەکانمان، ژیانی پێشەوای مرۆڤایەتی پێغەمبەری ئازیزە (صلی الله علیه وسلم)، یەک لە خێزانەکانی کە ناوی (زینب) بووە تەڵاقدراو بووە، پێشتر خێزانی (زەید) بووە، لە ئەنجامی نەگونجانو پێکەوە هەڵنەکردن بڕیاری جیابوونەوەیان داوە، دوای ئەوە ئەم ئافرەتە بەڕێزە بووەتە هاوسەری باشترین مرۆڤی سەرزەویو شەرەفی دایکی هەموو باوەڕدارانی پێبەخشراوە!

لە ناو کۆمەڵگەی کوردیدا گرفتەکە تەنها بە جیابوونەوەی هاوسەران کۆتایی نایەت، بەڵکو زۆرجار دوو بنەماڵە نێوانیان تێکدەچێت، وادەزانم ئەو هاوسەرانە تاوانیان نەکردووە، تەنها نەیانتوانیوە وەکو دوو کەس لە ژێر ساباتێکدا ژیان بگوزەرێنن!

کەواتە نابێت ئێمەی کۆمەڵگەی کوردی بە چاوی هاوڵاتی پلە دوو، بڕوانین بۆ ئەو هاوسەرانەی لە یەکدی جیابوونەتەوە، چونکە کاتێک ژیان دەبێتە دۆزەخ ئاسا، بێگومان یەکجار شەڕ لە هەموو ڕۆژو ساتێکی پڕ لە شەڕو ئاژاوە باشترە، پێویستە ئەوان وەکو کەسێکی خاوەن ئەزموون سەیر بکرێنو ڕەنگە لە ژیانی ئایندەو هەڵبژاردنی هاوسەری داهاتوویان زۆر زیرەکانەترو بە ئارامترو باشتر مامەڵە بکەن، چونکە هەم قەدری دووری لە هاوسەر دەزانن چییەو هەمیش هەڵەکانی ڕابردوویان دووبارە ناکەنەوە، بەڵکو دەتوانن پلانێک بۆ خۆشکردنو دروستکردنی کەشێکی ئارامو پڕ لە خۆشەویستی بۆ هاوسەرانی نوێیان ئامادە بکەن!

لە هەمان کاتدا وەک چۆن نابێت کۆمەڵگە بە چاوێکی نائاسایی بڕوانێت بۆ ئەو هاوسەرانە، بە تایبەت کەسو کاری پیاوو ئافرەتەکە، پێویستە ئەوانیش خۆیان چ پیاو نابێت وابزانێت هەموو ئافرەتێک وەک خێزانی یەکەمی وایەو ناتوانێت لەگەڵ هیچ ئافرەتێکی دیکەدا ژیان بگوزەرێنێت، هەم ئافرەتیش نابێت وا بیر بکاتەوە کە هەموو پیاوێک وەکو هاوسەری یەکەمی مامەڵەی لەگەڵدا دەکاتو بە هەمان چاوی ڕقو کینەوە بڕوانێت بۆ هەموو پیاوانی دنیا!

لە مێژوودا بە هەزاران نموونەمان هەیە، کەسانێک لە ئەزموونی یەکەمیاندا سەرکەوتوو نەبوون، بەڵام بۆ جاری دووەمو لە ئەزموونی نوێی ژیاندا توانیویانە زۆرسەرکەوتوو بنو ببنە پێشەنگ بۆ کەسانی دوای خۆیان!

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا دەبێت دان بەو ڕاستییەدا بنێین کە هۆکاری جیابوونەوە زۆر دەگمەنە بە تەنها پیاو، یان ژن تاوانبار بێت، زۆربەی جار هەڵەی هەردووکیانە، ئەوەی گرنگە ئەوەیە لە هەڵەکانی ڕابردووی ژیان پەندو وەربگرینو بیانکەینە پەیژە بۆ سەرکەوتنو هەستانەوەی جارێکی دی! بە بڕوا بەخۆبوونو ورەبەرزیو کەساتییەکی بەهێزەوە پلان دابنێین بۆ دروستکردنەوەو بنیاتنانەوەی ژیانێکی نوێ!

ئەم بابەتە پشتگیری نییە لەوەی کە هەر کەس ناخۆشییەکی لەگەڵ هاوسەرەکەیدا هەبوو پەنا بۆ تەڵاق ببات، بەڵکو ئەمانە لە کاتێکدایە کە هەموو ڕێگە چارەکان بە بنبەست گەیشتوون!

بە پشتیوانی خودا لە بەشی دووەمدا باس لەو پێشنیارو پلانانە دەکەین کە دەبنە هۆی کەمکردنەوەی تەڵاق لە نێو هاوسەراندا. پاشان باس لە ژیانی ئەو هاوسەرە بەڕێزانە دەکەین کە توانیویانە لە ئەزموونی نوێی ژیاندا بەختەوەرو سەرکەوتوو بن.

# بڕیار

## ژووانی بڕیار

لە ڕۆژانی ٢-٢٠١١/٤/١١ لە پێشانگای شەشەمی نێودەوڵەتی کتێب لە هەولێر، گۆڤاری بڕیار ژووانێکی چکۆلانەی بۆ خۆشەویستانی سازکردبوو...

چەندە جێگای شادمانی بوو، وەختێك دەمدیت لە دوورەوە خۆشەویستانو دۆستانی بڕیار چاویان دەگێڕاو بە دووی نازدارە پڕنازە دڵسۆزەکەی خۆیاندا دەگەڕان.

هێدی هێدی بەتاسەوە نزیك دەبوونەوەو بە دیداری ژمارە بە ژمارەی بڕیار چاویان کلباران‌و دڵیان گوڵباران دەکرد.

لەوێدا لە نزیکەوە بە زۆرێك لەو خۆشەویستانە ئاشنا بووین کە هەر لە دوورەوە بەڕۆحیان ئاشنایین‌و لەگەڵ ئاواتو خۆزگەو هیواکانیاندا دەژین.

کەسانێك دەهاتنە ژووانی بڕیار، وێڵی ژمارەیەك یا دووانی بڕیار بوون، کە بەحەسرەتەوە دەیانگوت لە دەستمان چوون!

هەندێك تەنها بۆ بینینی بڕیارو دۆستانی هاتبوون‌و ئەوەی دەیانگوت بە باڵای یاری خۆیاندا نەیاندەگوتەوە. بڕیار هەستی بەوپەڕی شادمانی دەکرد کە توانیویتی لە ماوەی تەمەنێکی کورتدا عاشقانی وشەو پەیڤی جوان پەروەردە بکاتو کەسانێك وەها لێبکات نەتوانن بێ خوێندنەوە بژین.

ئەوانەی دەهاتنە ژووانی بڕیار، مامۆستایانی زانکۆ، پارێزەران، دەروونناسان، سیاسەتمەداران، خوێندکارانی زانکۆ، پەروەردەکاران، مامۆستایان‌و توێژە جیاکانی کۆمەڵگا بوون!!

کەواتە دڵخۆشی بڕیار لە جێی خۆی دایە کە توانیویتی لە نێو هەموو ئەو دڵانەدا جێگایەك بۆ خۆی بکاتەوەو ببێتە خۆشەویستی هەمیشەییان!

بەندەش چەندە خۆشحاڵ بوو کاتێك دەمبینی بڕیار هەموو ڕەنگەکانی لە ژێر ساباتی خۆشەویستی دا کۆکردۆتەوەو هەموو خوێنەران بە ئامانجە گەورەکانەوە گرێ داوەو هەموو لە بیری ئەوەدان چی بکەن‌و چۆن خزمەتی وڵاتەکەیان بکەن.

هەستی دەکرد خوێنەرانی ئەم گۆڤارە تا ڕادەیەکی زۆر توانیویانە پەیامەکانی لە خودی خۆیاندا جێبەجێ بکەن. نەمبینی یەکێك لەوان خۆی بەشتە لاوەکییەکانەوە خەریك بکات، یا پەنجەی تۆمەت بۆ ئەملاولا ڕابکێشێت، چونکە لەوە تێگەیشتوون کە ئەگەر خۆیان بە کارێك هەڵنەسن کەس نییە شتێکیان بۆ ئەنجام بدات.

لە چاوانیاندا دەریایەك ئاواتو خۆزگەم دەبینی، لە بازوویاندا هێزێکی پۆڵایین، هیممەتێکی بەرز، لەسەر لێوەکانیشیان خەندەیەکی شەرمن!

خۆشەویستانم: بە دیداری ئێوەی بەڕێز ماندوێتیمان دەحەسێتەوە، وزەیەکی نوێمان پێدەبەخشن.

بێگومانین کە ئێمە پێکەوە داهاتوویەکی ڕۆشن، مێژوویەکی نوێ، بۆ ئەم گەلە تۆمار دەکەین. ئایندەش تەنها بۆ دڵسۆزان‌و تێکۆشەرانی ماندوونەناسە.

